تاریق ئۆسلو



# ئاژەڵەکان

چەندین ڕاستی سەرسوڕهێنەر دەربارەی ئاژەڵەکان کە تا ئێستا لە کتێبی زیندەوەرزانی و کتێبە زانستییەکانی دیکەدا باس نەکراوە.



بە دیهێنراوە سەرسوڕهێنەرەکان

# ئاژەڵەکان



چەندەها ڕاستیی سەیروسەمەرە دەربارەی ئاژەڵەکان،

کە لە کتێبەکانی زانستی ژیان و زانستەکاندا بەدی ناکەین!



# ئاژەڵەکان

نووسینی: تاریق ئوسلو

نیگارکێش: سێڤگی ئیچگەن

وەرگێڕانی: دۆستی عوسمان

نۆرەی چاپ: یەکەم ٢٠٢٣

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان،

ژمارەسپاردنی (١٧٩٤)ی ساڵی (٢٠٢٢)ی پێ دراوە.



**ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا**

**ARA MEDIA CENTER**

+964 (0) 770 938 3000 | +964 (0) 750 938 3000

www.aramediacenter.com info@aramediacenter.com

**بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوی بەرهەمەکان: سلێمانی، شەقامی سەرەکی ئیسکان، نزیك کەمپی ناوشاری زانکۆی سلێمانی**



# پێشەکی



زنجیرەیەکـــی نـــوێ وا دەســـت پـــێ دەکـــات! **(زنجیـــرەی بەدیهێـــنراوە سەرســـوڕهێنەرەکان)** دەزانـــن بـــۆچی ئەم ناونیشـــانەمان هەڵبژارد؟ چونکە ئەم زنجیرەیە بەڕاستی زۆر سەرسوڕهێنەرە!

کە دەڵـێم سەرسـوڕهێنەر، واتە شـتێکی سـەیر، نـامۆ، دەرئاسـا، سەرنجڕاکێش، چاوزەقکەرەوە، شتێک پێی ڕانەهاتبین...

باشە، چ شتێک سەرسوڕهێنەرە؟

هەموو شتێک!

بەڵـــێ، لە ڕاســـتیدا هەرچیـــیەک لە چواردەورمانـــدایە زۆر سەرســـــــوڕهێنەرە. بەڵام بەهـــــۆی نەخۆشـــــــییەکی درمەوە -گـوێزەرەوە- کە پێـی دەوترێـت ڕاهـاتن و جارێـک تووشـی بـووین بەئاســـانی لێـیدەرباز مـــان نابێـــت، ئیـــدی ملیۆنـــان بەدیهێـــنراوی سەرســـوڕهێنەری دەوروبەرمـــان بە سەرســـوڕهێنەر نـــابینین. یـــان ڕاســـتتر بڵـــێم: درککـــردن بە سەرســـوڕهێنەریی ئەو بەدیهێـــنراوانە لەگەڵ یەکەم بینینـــدا کەمێـــک ئەســـتەمە. هەر کە بە ڕواڵەتەکەیـــان ڕاهـــاتین -گەرچـــی لەپـــێش چاوانیشـــماندا بـــن- ئیـــدی لەبەرامـــبەر

دەرئاسایی و سەرسوڕهێنەریی و ناوازەیی ئەو بەدیهێنراوانەدا نابینا دەبین.

- چی بووە گیانەکەم، مریشکە و هێلکە دەکات. خودا نەیبڕێ!
- ئێ ئەوە مانگایە مانگاااا! شیر نەیات چی بکات!
- کە وتت درەختی سێو واتا سێو دەگرێت، دەتویست شاڵی قاپشۆرین بگرێت؟
- مەبەستت ئەوەیە ئەگەر شاڵی قاپشۆرینی بگرتایە، لە ئێستا سەرسوڕهێنەرتر دەبوو؟
- هینە... ئەی چۆن!

ئەم چەشنە قسانە دەریدەخەن، خەڵکی چی دی بەرامبەر بەدیهێنراوە سەرسوڕهێنەرەکان بەئاگا نین.

خۆ گەر کەمێک بیر بکەینەوە، تێدەگەین نە مریشک، نە هێلکە، نە مانگا، نە شیر، نە درەخت، نە میوە... هیچ کام لەمانە بەدیهێنراوێکی ئاسایی نین. هەریەکێکیان، بەتەواوی واتا؛ دەرئاسا، ناوازە، موعجیزە... واتە سەرسوڕهێنەرن.

بۆ نموونە، هێلکەیەک بە دەستتەوە بگرە. بە چاوێکی دی جگە لە چاوە برسییەکەت تەماشای بکە! دواتر بیهێنە پێش چاوت، ئەم هێلکەیە، کە زۆربەمان تەنانەت ناتوانین وێنەکەشی بەڕاستی بکێشین، مریشکێک لە کوێوەی دێنێتە دەرەوە! نە

پڕگـــاڵی پێــیه، نه گۆنیـــا، نه ژمێــرەر، نه کتێــب!.. مریشــکێک بەدرێژایــی ڕۆژ گەنــم و وردە نــان و کــرم و وردە مێــروو بخــوات، بە ڕای ئێــوە، سەرســوڕهێنەر نیــیە بتوانێــت قــاوغێکی نایــاب و ناوازەی وەک توێکڵی هێلکە دروست بکات؟

ئەوە باســی نــاوەوەی هــێلکەکە هەر نــاکەم، چــونکە ئەویــان زۆر سەرسوڕهێنەرترە!

ئایـا جێـی خـۆی نیـیە لە ئاسـت گشـت ئەو درەختـانەی بە ڕەگ و ڕیشـاڵیان قـوڕ و قـوڕاو دەخـۆنەوە، بەڵام لە لقەکانیـانەوە میـوەی تــازە و ئــاڵ و جــوان و شــیرینی وەک هەنــار، پرتەقــاڵ، ســێو و گێلاســـــمان پـــێ دەبەخشـــن، چاومـــان زەق ببێـــتەوە؟ ئایـــا سەرسوڕهێنەر نین؟ نەک هەر سەرسوڕهێنەر، موعجیزەشن.

باشــە، ویژدانتــان هەبێــت، ئایــا مانگــایەکی ســەرزل، کە بەم ڕۆژگــارە گژوگیـا و کـا دەخـوات، کەچـی دواتـر دەبێـتە کانیـاوی شیر بۆمان، سەرسوڕهێنەر نییە؟ ناوازە نییە؟ موعجیزە نییە؟

لەم پێشـەکییە کـورتەدا بە نمـوونەی زیـاترەوە سـەرقاڵتان نـاکەم. بەڵام لە درێـــژەی زنجیـــرەی بەدیهێـــنراوەسەرســـوڕهێنەرەکانەدا نمـــوونەی زۆر زۆرتـــان لە جیهـــانی ئـــاژەڵانەوە، لە جیهـــانی ڕووەکەکــانەوە، لە جەســتەی خۆمــانەوە، لە بۆشــای ئاســمانەوە، لە ڕووی زەویـــیەوە، لە دەریاکـــانەوە، لە شـــاخەکانەوە، لە شـــنەی

بـاوە، لە هەورەکـانەوە، لە مێرووولەکـانەوە، لە هەنگەکـانەوە... بـۆ دەهێنمەوە.

شـتی زۆر سەرسـوڕهێنەرتان بـۆ بـاس دەکەم. ئەو شـتە سەرسـوڕهێنەرانە داسـتان و ئەفسـانە و مەفسـانە نـین! بەڵکـو باسـی ئەو شـتە سەرسـوڕهێنەر و نـاوازە و موعجیزانەتـان بـۆ دەکەم کە لە گەرد بە گەردی ئەم گەردوونەدا هەن!

لە کتێبێکـدا بە نێـو جیهـانی ڕووەکەکانـدا دەگەڕێـین، لە یەکێکـی دیـکەدا لە جەسـتەی مـرۆڤ ورد دەبیـنەوە، لەوەی دواتـردا ڕۆدەچیـنە بۆشـایی ئاسـمان و هەنگـاو بە هەنگـاو بە نێـو ئەستێرەکاندا دەگەڕێین....

ئاگـاداری! ئاگـاداری! زنجیـرەی بەدیهێـنراوە سەرسوڕهێنەرەکان وا دەست پێ دەکات!

بەڕاستی زۆر سەرسوڕهێنەرن!

***

یەکەم کتێبی زنجیرەکەمان، ئەو ئاژەڵە سەرسوڕهێنەرانەیە!

دەی فەرمـــوون! ئاســـک، وشـــترمرخ، مـــار، هەنـــگ، کـــوللە، پڵنگ و لوولپێچەکان وا چاوەڕێتانن!

"ئامان! پێیان پێدا نەنێن!"

زۆر سەرسوڕهێنەرن، زۆۆۆۆر!



**تارق ئوسلو**

**پایزی ٢٠٠٨**

**زۆر سەرسوڕهێنەرە!**

# کێ بەهێزترینە؟



ئەگەر ئاسکە قالۆنچەیەک[1] تەماشای پاڵەوانێتی بەرزکردنەوەی قورسایی بکردایە، ئەوا لە پێکەنیندا دەکەوتە سەر گازی پشت، چونکە ئاسکە قالۆنچەیەکی ٢ گرامی دەتوانێت ٢٠٠ هێندەی کێشی خۆی بەرز بکاتەوە. بیهێننە پێش چاوتان، پاڵەوانێکی قورسایی بەرزکردنەوە بتوانێت بە هەمان ڕێژە قورسایی هەڵبگرێت! واتە گەر پاڵەوانێکی ١٠٠ کیلۆیی هێندەی ئاسکە قالۆنچەیەک بەهێز بووایە، دەیتوانی ٢٠ تەن بەرز بکاتەوە!

بە هەمان شێوە، گەر ئاسکە کێوییەک بەشداریی مەراسۆنێک بکات؛ ئەوا مرۆڤەکان زۆر داماو دەردەکەون. چونکە لە نێو مرۆڤەکاندا، تەنانەت خێراترین ڕاکەریشیان بە ٢

---

١- stage beetle

کـاتژمێر ئەوجـا دەتوانێـت ماراسـۆنێک ببڕێـت، کە دووریـیەکەی ٤٢ کیلـۆمەترە. بەڵام ئەم دووریـیە تەنهـا ٤٠ خـولەکی ئاسـکە کێـوییەک دەگرێـت، چـونکە دەتـوانن بە خێرایـی ٦٥ کیلـۆمەتر لە کاتژمێرێکدا ڕابکەن!

پەروەردگـار تایبەتمەنـدیی خێـرا ڕاکردنـی بە ئاسـکە کێوییەکـان داوە تـا بتـوانن خۆیـانی پـێ بپـارێزن. بەم جـۆرە دەتـوانن زۆر جـار لە دەستی پڵنگ و شێر و دڕندەکانی دیکە هەڵبێن.

ماسـولکە کۆئەنـدام و قاچەکـانی ئاسـکە کێـوی تـایبەت بـۆ خێـــرا ڕاکـــردن دروســـت کـــراون، بەڵام لە هەمـــووی سەرسوڕهێنەرتر سییەکانیانە.

سـییەکانی ئاسـکە کێوییەکـان بە جۆرێـک دروسـت کـراون، دەتـوانن زۆر لە مرۆڤەکـان خێراتـر هەناسـە بـدەن. بەهـۆی ئەم سـییە (تۆربۆئاسـایانەوە) ئاسـکە کێوییەکـان لە هەر خولەکێکـدا ٤ یان ٦ هێندەی مرۆڤەکان زیاتر هەوا هەڵدەمژن.

کاتێـک ئـێمە ڕادەکەیـن، تووشـی هەناسـەبڕکێ دەبـین، بەڵام ئاسـک بەهـۆی سـییەکانیانەوە هەرگیـز تووشـی هەناسـەبڕکێ نابێت!

ئەی باشـە، دەبێـت حـاڵی ئەو پڵنگـانە چـۆن بێـت کە ناچـارن ئاسکی کوێی ڕاو بکەن تا سکی خۆیانی پێ تێر بکەن؟

ئەوانیش ڕاکەری باشن.

بەهـۆی کۆئەنـدامی ئێسـک و بڕبـڕە ناوازەکەیـانەوە دەتـوانن لە شوێنی خۆیـانەوە بـازێکی ١٤ مەتـری بـدەن. تەماشـا! چەنـد بـاش بـوو فێـری ئەمە بـوون. هەرگیـز نەکەن بە سـەرکزی و دامـاوی پڵنگێـک هەڵبخەڵەتـێن و لە ١٤ مەتـر زیـاتر لێـی نزیـک ببـنەوە. خۆی هەر باشـترە هـیچ لێـی نزیـک نەبنەوە، چـونکە پڵنـگ لەگەڵ کەوتە ڕاکـردن لە مـاوەی ٢ چـرکەدا دەگـاتە خێرایـی ٧٥ کیلـۆمەتر لە کاتژمێرێکـدا. بەڵام ئـێمەی مـرۆڤ لەو مـاوەیەدا تەنیـا دەتـوانین بگەیـنە خێرایـی ٢٥ کیلـۆمەتر لە کاتژمێرکـدا. ئەمەش واتە لە چنگی پڵنگەکە دەربازتان نابێت.




سـەد سـاڵێک لەمەوبەر زۆرانبـازێکی ئەمریکـی لەخـۆڕازی داویەتـی لە کەڵـلەی و وتـویەتی: **"لەگەڵ شـێردا زۆران**

دەگرم." ئامانجی ئەوە بووە بیسەلمێنێت مرۆڤ لە شێر بەهێزترە.

وا دیارە بە منداڵی چیرۆکی تەڕەزانی زۆر خوێندووەتەوە و لەژێر کاریگەریی ئەو چیرۆکانەدا وای وتووە.

هەرچەندە هاوسەرەکەی هەوڵی داوە لەم کەللەڕەقییەی پاشگەزی بکاتەوە، بەڵام بێسوود بووە و سەرئەنجام زۆرانبازەکە لەگەڵ شێرێکدا زۆرانی گرتووە و لە پێش چاوی سەدان کەسدا لێی بردووەتەوە!



- چی؟! لە شێرەکەی بردووەتەوە؟

بەڵێ، بەڵام فێڵێکی بچووک (!) لەم بردنەوەیەیدا بووە. پیاوەکانی زۆرانبازەکە بەر لەوەی شێرەکە بەرنە مەیدانەکەوە، بە تۆڕێکی زۆر بەهێز، کە لە دوورەوە دیار نەبووە، دەمیان بەستووە. چەپۆکەکانیشیان لە دەستکێشی هاوشێوەی ئەوانەی داپیرەت بۆتیان دەچنێت، گرتبوو.

دەی لەم هەلومەرجەدا شێرەکە چی بکات؟ جگە لەوەی لە ڕووی دەروونیشەوە ڕووخاندوویانە!

ئەگەر ئەم فێڵە بچووکە نەبووایە، ئەوا نەک ئەو زۆرانبازە، خودی تەرەزانیش بووایە (یان فانتۆماش[٢] بووایە) تەنیا لە خەونیدا دەیبینی وا بەئاسانی شێرێک بدات بە زەویدا.

لە باسی بەهێزیدا، ورچەکانیش ناوبانگی خۆیان هەیە.

ورچێکی قاوەیی دەتوانێت وەک پارچە کاغەزێک دەرگای ئۆتۆمبێل لوول بکات. بەتایبەت گەر ئۆتۆمبێلەکە گۆزەیەک هەنگوینی تێدا بێت، ئەوا لە خۆشیاندا دە جار بەسەر یەکەوە دەرگاکانی لوول دەکات.

---

٢- فانتۆما: پاڵەوانی زنجیرەیەکی فەرەنسی سەدەی بیستەمە و گوایە ئەم کەسایەتییە هێزی چل شێری هەبووە. (وەرگێڕ)




وا بـزانم پێویسـت ناکـات بڵـێم فیلەکـانیش چەنـد بەهێـزن. تەنهـا هێنـدەتان بیربێـت ئەو لـووتە ناوازەیەیـان، کە لە ٤٠ هەزار ماسـولکەی جیـا پێکهـاتووە، دەتوانێـت مرۆڤێـک بگرێـت و بەئاسانی بەسەر دارێکدا وەک قۆچەقانی هەڵیبدات.

هیپۆپۆتامەسـەکان! هەرجارێـک هیپۆپۆتامەسـێک دەبیـنم... تـۆ بوەسـتە، هیپۆپۆتـامەس چیـیە؟ گیـانەکەم، ئەسـپی ئـاوییە. نـازانم کـوێی لە ئەسـپ دەچێـت! بەهەرحـاڵ، هەر کاتێـک ئەسـپی ئـاوی دەبیـنم، ئەو دەمە زەبەلاحەیـان دەکەنەوە و گوێچکەیـان وەک شەقشـەقە ڕادەوەشـێنن؛ دەکەومە پێکەنـین. زۆر شـیرینن. بەڵام ئەوە پێتـان دەڵـێم بـاش نیـیە لێیـان نزیـک ببـنەوە، چـونکە شـەویلگەیان هێنـدە بەهێـزە، دەتـوانن بەئاسـانی کـوتەکێکی داری پێ وردوخاش بکەن.




بەڵام لە باسی گازگرتندا شان لە شانی قرش نادەن، چونکە کاتێك قرش بەتوندی دەمی دادەخات، هەر سانتیمەترێکی ددانەکانی پەستانێکی ٣ تەنی دروست دەکەن. ئیتر وا بزانم پێویست ناکات بڵێم: ئەوەی لە نێوان ددانەکانیدایە چی لێ دێت!

گۆریلاکانیش دەتوانن وەک چیلکەیەک لوولەی تفەنگ بشکێنن. جوانەگاش هەیە دەتوانێت تەختەیەکی پانزە بیست سانتیمەتری بە یەک لێدانی سەری پارچە پارچە بکات.





خوتخوتەتـــان نەبێـــت و خۆتـــان بە لاوازتـــرین بـــوونەوەری ســـەر ڕووی زەوی مەزانـــن! چـــونکە ئێســـتا گەیشـــتینە ئەو بەشـــەی دڵتـــان هێـــور دەکـــاتەوە و لە خۆبەکەمزانینتان لە چاو ئاژەڵەکاندا ڕزگارتان دەکات.

بەڵـــێ، هەر ئاژەڵێـــک چەنـــدێک هێـــزی پێویســـت بووبێـــت، پەروەردگـــار ئەوەنـــدەی پـــێ بەخشـــیوە. مـــرۆڤیش لە پـــاڵ ماســـولکەکانیدا، کە تـــا ئەنـــدازەیەک بەهێـــزن، پەروەردگـــار هێـــزی ئەقڵـــی پـــێ بەخشـــیوە، کە زۆر زۆر زۆر لە هێـــزی ماســـولکە گـــرنگترە. ئـــێمە بە بەکارهێنـــانی ئەم هێـــزە ترســـناکەمان دەتـــوانین لە ســـێرکدا وەک بووکەشووشـــە یـــاری بە شـــێر و پڵنـــگ بکەیـــن. منـــداڵێکی وردیـــلە دەتوانێـــت شـــووڵێک بە دەســـتییەوە بگرێـــت و گـــایەکی زەبەلاح پـــێش خـــۆی بـــدات و ببیـــات بـــۆ کـــانی و ئـــاوی نەدات و بیهێنێـــتەوە. (بەڵام دڵنیـــام گـــایەکە ئەمەی پـــێ خـــۆش نابێـــت!) کچـــۆڵەیەکی خنجـــیلە دەتوانێـــت گـــوانی مانگـــایەکی دوو تەنـــــی بدۆشـــــێت و شـــــیرەکەی بکـــــاتە ســـــەتڵێکەوە. ئەســـــپی ئـــــاوی لە بـــــاخچەی ئاژەڵاندا بەنـد دەکەیـن و تـــــوێکڵی شـــــووتی



دەرخـــوارد دەدەیـــن. نەهەنگـــی زەبەلاح بە دوای کەشـــتییەکانماندا ڕادەکێشین و لە چەورییەکەی مۆم دروست دەکەین.




ئـــێمە مـــرۆڤین، پەروەردگـــار ئـــێمەی لە هەمـــوو زینـــدەوەرانی دیکە باڵاتر ئەفراندووە.

حەز دەکەن بچـــن لە ئاوێنەیەکـــدا تەماشـــای خۆتـــان بـــکەن. مـــادەم هەر دەچـــن، ببیـــنن پەروەرێـــن لە چـــاو زینـــدەوەرانی دیـــکەدا چەندە جوان دروستی کردوون و سوپاس و ستایشی بکەن...

# کاتێك ئاژەڵان نەخۆش دەکەون...



**ها... ها... هاا... هااپشیووو!**

منـداڵەکان، خــودا بتانپارێزێــت. مــن کەمێــک ســەرمام بــووە. لیمــۆ و نەعنــایەکی گەرمــم بە دەســتەوەیە و خــۆم لە بەتــانییەکی ئەســتوورەوە پێچــاوە. وتــم گەر کەمێــک ئــارەق بــکەمەوە، ڕەنــگە باشتر بــبم. گەر نەبــوو، سبەینێ دەچــم بــۆ لای پزیشــک. هیــوادارم دەرزیــم بــۆ نەنووســێت! خــودایە گیــان! بەس دەرزی نەبێــت، ڕازیــم چــی شرووبــی تــاڵە دەیخــۆمەوە، چــی حەبــی گەورەیە قووتی دەدەم، بەس دەرزی نا!

بەڵام گەر هەر چـــارم نەمێنێـــت، ئەوا دەرزی لە خـــۆم دەدەم. دراوســـێکەی نهـۆمی ســەرەوەمان کوڕێکیــان هەیە، نــاوی توانــایە. ئەو جــارە نەخــۆش کەوتبــوو. پزیشــکیش دەرزی بــۆ نووســیبوو. دایکــی دەیــوت: "توانــای ئــێمە ئەو هەمــوو دەرزیــیەی لێــدرا، چرتەی نەکرد!"

بەڵێ، بێگومان ئەگەر ناچاربم، منیش دەرزی لە خۆم دەدەم، بەڵام کەس بەتەما نەبێت وەک توانا بەغیرەت بم! وەک بیستوومە توانا لە مشک دەترسێت، من نە لە مشک و نە لە هیچ ئاژەڵێکی دیکە ناترسم. لە ترس گەڕێن، هەر زۆریشم خۆش دەوێن، بەس مشک زۆر نا!

مادەم لە باسی نەخۆشی و ئاژەڵانداین، حەز دەکەن یادەوەرییەکی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە؟ گەر کەس ناڕازی نییە، دەرزییەکە دەوەشێنم!

گاڵتەم کرد، گاڵتە...

***

ماوەیەکی زۆر بەر لە ئێستا، سەگێک لە باخچەکەماندا دەژیا و لەگەڵ باوکم دەچوو بۆ ڕاو. ناوی چرتە بوو. چرتە بە تووکە لوولە قاوەییەکەوە سەگێکی زۆر سەیر بوو. سەگێکی باش بوو و تا کۆتا ڕۆژەکانی تەمەنی لە باخچەکەی ئێمەدا ژیا.

ڕۆژێکی هاوین، بینیم چرتە وەک مانگایەک لە باخچەکەدا خەریکی گیا خواردنە.

بەڵێ، چرتە سەگێکی نەوسن بوو. پێشتر بینیبووم فاسۆڵیا و برنج و تریتی نان و کێکی دەخوارد، بەڵام هەرگیز چاوەڕوانی ئەمەم لێ نەدەکرد.



چاوەکانم هەڵگلۆفی. بەڵێ، خۆی بوو و گیای دەخوارد.

ئێوارە کە باوکم گەڕایەوە،هەر لە ناو دەر گاکەدا پێشم گرت و بەجۆشوخرۆشێکەوە ڕاپۆرتی گیا خواردنی چرتەم خستە بەردەمی.

باوکم کە لەسەر کار دەگەڕایەوە، زۆر ماندوو بوو، بەڵام هەرگیز پرسیارەکانی منی بێوەڵام نەدەهێشتەوە.

پێی وتم: "سکی دێشێت!"

پرسیم: "مەبەستت چییە؟"

وتی: "کوڕەکەم، سەگەکە سکی دێشێت. سەگ بۆ ئەوەی ئازاری ناوسکی بڕەوێنێتەوە، گیا دەخوات!"

- سەگیش سکی دێشێت؟

- ئەی چۆن!

- ئینجا دەچن گیان دەخۆن؟

- بەڵێ گیانەکەم، خۆ ناچن دەرمان بخۆن!

- باشــە، چــۆن دەزانــن کاتێــک ســکیان ئــازاری هەبــوو، دەبێــت بچن گیا بخۆن؟

- خودا فێری کردوون.

- ئەی چۆن دەزانن کام گیایە باشە؟

- خودا پێیان نیشان دەدات...

لەوەودوا زۆر جــار چــرتەم بینیــوە گیــای خــواردووە. خــۆ وتــم: چــرتە ســەگێکی نەوســن و قەڵەو بــوو، کەوایە زوو زوو سکیشــی دەئێشا.

***

پەروەردگــار چەنــدین تایبەتمەنــدیی جیــاوازی بە ئــاژەڵان داوە تــا خۆیــانی پــێ بپــارێزن. بــۆ نمــوونە، کیســەڵ قــاوغی ڕەقــی هەیە، باڵنــدەکان توانــای فڕینیــان هەیە، ئاســک خێــرا ڕادەکــات، بــۆق خــۆی دەخــزێنێتە ژێــر ئــاو... ئــاژەڵە نەخۆشــەکانیش بە چەنــدین ڕێگــا و شــێوازی جیــاواز جیــاواز، کە پەروەردگــار فێــری کــردوون، ڕێــی چارەســەر دەگرنە بەر.



ئێستا یەک دوو نموونەی زۆر سەرسوڕهێنەرتان بۆ باس دەکەم:

بەگشتی مەیموون گەڵا و میوە دەخوات. هەندێک جار بێ ئەوەی گەڵاکان بجوێت، قووتی دەدات. ئەمە لە نەوسنییان نییە، بەمەبەست وا دەکەن، چونکە ئەو گەڵا نەجۆراوانە بۆ پاککردنەوەی گەدە و ڕیخۆڵەکانیان لە مشەخۆرەکان بەکەڵکن. چۆنە؟ بیرۆکەیەکی باش نییە؟ باشە، بەڵام بۆ مەیموون باشە!

ئەی باشە، مەیموونێک گەر دەستی یان قاچی بریندار بێت، چی دەکات؟ ڕووەکی ئەڵیۆ دەدۆزێتەوە و گەڵای ڕووەکەکە دەشکێنێتەوە و شلەکەی ناوی لە برینەکانی دەدات.



بە ڕای ئێوە، مەیموون لە خۆیەوە دەزانێت شلەی گەڵای ڕووەکی ئەڵیۆ بۆ برین باشە؟ بێگومان نەخێر! وەک هەموو ئاژەڵێکی دیکە، ئەوانیش پەروەردگار فێری کردوون.



- تووتییەکانیش شەیدای میوەی ورد و ڕەنگاوڕەنگن. بەڵام هەندێک لەم میوانە ژەهراوین. لەبەر ئەوە دەبێت زوو زوو ژەهراوی بن. بەڵام دەبینین وا نییە! چونکە تووتییەکان دوای هەر ژەمە خواردنێک کەمێک قوڕ دەخۆن. ئەم قوڕەش ژەهرەکەی گەدەیان هەڵدەمژێت و ئاسانتر فڕێی دەدەنە دەرەوە.

• گەر بڵێم فیلەکانیش بۆ ئەوەی لە مشەخۆرەکانی سەر پێستیان دەربازیان بێت خۆیان دەخورێنن، پێم پێدەکەنن. چونکە هەموومان باش دەزانین دەست و قاچی فیل بۆ خوران گونجاو نییە.

باشە، ئەی چی دەکەن؟

لەناو قوڕدا پاڵ دەکەون. بەڵێ فیل هەر کە قوڕ و لیتەیەکی بینی، خێرا لێی پاڵ دەکەوێت. بەم جۆرە لە مشەخۆرەکانی پێستی دەربازی دەبێت.





زەڕافەکـــانیش لەبەر ئەوەی ملێکـــی درێژیـــان هەیە، دەبێـــت پێکهـــاتەی ئێســـکەکانیان زۆر پـــتەو بێـــت. بـــۆ ئەمەش مەرجە کالســـیۆمی زۆر بخـــۆن. باشـــە، چـــۆن کالســـیۆمیان دەســـت دەکەوێت؟

گەر بڵـــێم لە "دەرمانخـــانەکەی ســـەری کـــۆڵان؟" هـــیچ کە وەڵامێکی ڕاست نییە، گاڵتەیەکی پێکەنیناویش نییە!

وەڵامە ڕاستەکەی:

"بە لێسانەوەی ئەو ئێسک و پروسکانەی دەیاندۆزنەوە!"

**بەڵــێ منــداڵەکان! وەک بینیتــان، پەروەردگــار سرووشــی جیاجیــای بە هەر یەکێــک لە ئــاژەڵە خــاوەن تایبەتمەنــدییە جیاجیاکـان بەخشـیوە. بە مـرۆڤیش عەقڵ و هۆشـی بەخشـیوە. بـۆ ئەوەی بیــر لەم شــاکارە نــاوازانە بکەیــنەوە و پەنــدیان لــێ وەربگـرین، هەروەهـا بـۆ ئەوەی بشـتوانین چـاک و خراپـی ژیـانی خۆمان لە یەک جیا بکەینەوە.**

"ها... ها... هاپشیووو!

لیمۆ و نەعنایەکی دیکە بخۆمەوە باش دەبم..."



# چۆن ئاژەڵان دەخەون؟



گەر دەزانن چەندم خەو دێت! بەڵام ناخەوم، چونکە دەبێت ئەم نووسینەم تەواو بکەم. بەڵام هێشتا نازانم چی بنووسم. هێندەم خەو دێت، دەڵێیت یەک ڕەوە فیل لەسەر پێڵووی سەرەوەی چاوم دانیشتوون. نا نەخێر! دەبێت نووسینەکەم تەواو بکەم. لەسەر قەنەفەکە هەڵدەستم و دەچمەوە سەر مێزەکەم.

ئەوە چییە؟

ماسییە ژاپۆنییە خرپنەکەم، کە لەسەر مێزەکەم لەناو شووشەیەکدایە، بەم کاتەی شەوە هێشتا بەخەبەرە و چاوە گەورەکانی زەق زەق کردوونەتەوە و سەری ناوە بە شووشەکەوە و تەماشای دەرەوە دەکات.

"خرپنی بچکۆلە! تۆ خەوت نایەت؟"

خولەکێک بوەستن! باشە، ماسی دەخەوێت؟ ئەی ئاژەڵەکانی دیکە؟ دەزانم سەگ و پشیلە دەخەون. ئەی باشە، ئاسک، فیل، مار و مێرووەکان... منداڵەکان، زانیم چی بنووسم! بۆ وەڵامی "ئایا ئاژەڵەکان دەخەون؟" دەگەڕێم.

## خەونی شیرین لە ژێر ئاودا

ماسی گەر نەجووڵێت، ناتوانێت لە ژێر ئاودا لە شوێنی خۆی بوەستێت. ناچارن پەڕەکانیان بە بەردەوامی بجووڵێنن. گەر وا نەکەن، نقوم دەبن. بەڵام خۆ دەبێت ئەوانیش بخەون. هەر کاتی خەوتنیان هات، ئەندامێکیان هەیە پێی دەوترێت "کیسەی هەوا"، پڕی دەکەن لە هەوا. ئیتر بەم جۆرە دەتوانن بێ ئەوەی بجووڵێن، بۆ ماوەیەکی زۆر لە قووڵاییەکی دیاریکراودا بمێننەوە.



خولەکێــک بوەســتن! ئەوە چیــیە؟ یەکێــک وتــی: "قــرش کیسەی هەوای نییە!"

ڕاســـتە، قــرش کیســـەی هەوای نیـــیە. لەبەر ئەوە ناچـــارن بەبەردەوامـــی لە جـــوولەدا بـــن، بەڵام ئەوانـــیش دەخەون. قــرش 'خەوگەڕە'، واتە بە دەم خەوەوە مەلە دەکات.

## چاوە هەمیشە کراوەکان

بە تەماشـــاکردنی چـــاوی ئاژەڵێـــک دەتـــوانین بـــزانین خەوتـــووە یـــان نـــا. گەر پێڵـــووی چاوەکـــانی داخـــرابن، ئەوا ڕەنـــگە خەوتبێـــت. گەر کـــراوە بـــن، ئەوا بە ئەگەرێکـــی زۆرەوە بەخەبەرە. باشـــە، ئەی ئەگەر پێڵـــووی چـــاوی نەبـــوو؟ بـــۆ نمـــوونە، مـــار پێڵـــووی چـــاوی نیـــیە. (واتە: پێڵـــووی چـــاوی جێگیـــرە و ناتوانێـــت دایانبخـــات.) چۆن بزانین خەوتووە یان نا؟



وەڵام: نازانین و تەواو!

سیســـتمی خەوتنـــی مێـــرووە وردەکـــان زۆر ســـادەیە. هەر لە شوێنی خۆت بوەستە و مەجووڵێ، بەسە.




## خەوتن بەسەر لقەکانەوە

باڵندەکان بەسەر لقی دارەکانەوە دەخەون، چونکە ئەوێ پارێزراوترین شوێنە بۆیان. کاتێک دەشخەون، بە پەنجەکانی قاچیان توند توند لقەدارەکە دەگوشن. ئیتر تا بەخەبەر دێنەوە، پەنجەکانیان ناکرێنەوە.

لە جیهانی باڵندەکاندا سەیرترین خەوتن هی فلامینگۆکانە. ئەوان لەسەر یەک قاچ دەخەون. هەندێک کەس هەن تەنانەت ناتوانن لەسەر یەک قاچ تاکە گۆرەوییەکیش لەپێ بکەن!

## هەندێک بەسەر پێوە دەخەون

خەوتن بەسەر پێوە بژاردەی زۆر ئاژەڵە. بۆ نموونە، ئەسپ و فیل و زەڕافە بەسەر پێوە دەخەون. گەورەترین

سوودی خەوتن بە پێوە ئەوەیە، گەر بارودۆخێکی نەخوازراو بێتە پێشەوە و لەپڕ بەخەبەر بێنەوە، پێویست ناکات وزەی زیادە بۆ هەستانە سەرپێ بەفیڕۆ بدەن.

کاتێک زەڕافە بە پێوە دەخەوێت، سەری بە دارێکەوە دەدات. وەک سەرینێک سەر دەخاتە سەر لقی دارێک و بەم جۆرە دەتوانێت پشوو بە سەر و ملی بدات.





پەنگـــوینی شـــاهانەش لەو ئـــاژەڵانەن کە بە پێـــوە دەخەون. پەنگـــوین بە پێیەکـــانی هـــێلکەکەی هەڵـــدەگرێت و تونـــد بە ســـکی خـــۆیەوە دەینووســـێنێت. گەر هـــێلکەکە بخزێـــت و بکەوێـــتە ســـەر بەفـــرەکە، لە مـــاوەی چەنـــد چرکەیەکـــدا دەیبەســـتێت. لەبەر ئەوە پەنگـــوینە شـــاهانەکان دەبێـــت بە دەم خەویشـــەوە وریـــابن. پەروەردگـــار هەســـتیارییەکی وەهـــای پـــێ بەخشـــیون، کاتێـــک بە هێلکەکەیـــانەوە دەخەون، هەســـت بە بچـــووکترین لەرزیـــن دەکەن و خێـــرا بەخەبەر دێـــنەوە. بـــۆ نمـــوونە، لەبەر ئەوەی بە کـــۆمەڵ دەژیـــــن، زوو زوو بەر یەک دەکەون. لە وەهـــــا بارودۆخێکـــــدا

پەنگوینەکە یەکسەر خەبەری دەبێتەوە و تەماشای هێلکەکەی دەکات.

گەر بڵێم: باسکردنی خەوتن خەوی زڕاندم، باوەڕ دەکەن؟ بەڵام هەر دەخەوم، چونکە دەبێت بەیانی زوو لە خەو هەستم. هیوادارم ئێوەش بە دەم خوێندنەوەی ئەم نووسینەوە خەوتان نەهاتبێت. ئەگەر خەویشتان هاتووە، هیوای خەوێکی خۆش و خەونێکی شیرینتان بۆ دەخوازم...



# کە زستان دێت...



وا دیـــارە کەس نیـــیە چیرۆکـــی زیکـــزیکە[3] و مێـــرووولەکەی نەبیســـتبێت. تـــۆ بڵێیـــت کەس هەبێـــت؟ هەبێـــت یـــان نـــا، مـــن بە کـــورتی چیرۆکەکەتـــان بـــۆ دەگێـــڕمەوە، چـــونکە پەیوەنـــدییەکی نزیکـــی بە باســـەکەمانەوە هەیە. لەوەش گـــرنگتر؛ بـــۆ ئەوەی بتـــوانم دەســـت بە نووســـینی باســـەکە بـــکەم، پێویســـتیم بە پێشـــەکییەکی سەرنجڕاکێشە!

نووســـەرێکی فەڕەنســـی بەنـــاوی 'لا فۆنتـــاین'، لە یەکێـــک لە کـــورتە چیرۆکەکانیـــدا، باســـی زیکـــزیکەیەک دەکـــات. ئەم

٣- (زیکزیکە) بە ئینگلیزی (Cicada)، جۆرە مێروویەکە کە زۆرتر لەو ناوچانەی کەشو هەوایەکی فێنک یان گەرمیان هەیە، دەژین.

زیکــزیکەیە لە ڕۆژێکــی ڕوونــاکی هاوینــدا، لەســەر گوڵێــک ڕاکشـاوە و خەریکـی گۆرانیـوتنە. لەم کـاتەدا، چـاوی دەچێـتە سـەر مێـروولەیەک کەوا بە لایـدا تێـدەپەڕێت. مێـروولە دامـاوەکە دەنـکە گەنمەشامییەکی بە کۆڵەوەیە و هەموو گیانی بووە بە ئارەق.

زیکــزیکەکە تێناگــات بــۆچی لە ڕۆژێکــی وەهــا خۆشــدا، مێروولەکە هێندە خـۆی مانـدوو دەکـات. بـۆیە گـاڵتە بە مێـروولەکە دەکات.

مێـــروولەکەش لە وەڵامـــدا دەڵێـــت: گشـــت ئەو هەوڵ و ڕەنجکێشـانەی بـۆ ڕۆژە سـارد و سـەختەکانی زسـتانە. لە درێـژەی چیـــرۆکەدا، قســـەی مێـــروولەکە ڕاســـت دەردەچێـــت و زیکـــــزیکەکەش ڕووبەڕووی ڕۆژگـــــارێکی زۆر ســــــەخت دەبێتەوە...

باشــە، هەر بەڕاســتی زیکــزیکە تەمــبەڵە؟ بێگومــان نەخێــر! وەک تەواوی ئــاژەڵانی دیــکەی جیهــان، ئەوانــیش ئەو ئەرکەی لەســەر شـانیانە بـێ کەموکـوڕی بەجێـی دەگەیەنـن. بە ڕای مـن، ئەمە بوختـانێکە لا فۆنتـاین دایهێنـاوە. (لە نێـوان خۆمانـدا بێـت، دەڵــێن ئەو کــابرایە زۆربەی چیرۆکەکــانی لە کەســانی دیــکە دزیوە.)

بەهەرحــاڵ، ئەمە باســەکەمان نیـیە و بــا بێینــە ســەر باســەکەی خۆمـان. دەمەوێـت پێتـان بڵـێم: ئـاژەڵان چـۆن زسـتان بەڕێ دەکەن

و جگە لە مێروولەکان، ئاژەڵەکانی دیکە چۆن ئامادەکاری بۆ زستان دەکەن.

لە ناخەوە حەز دەکەم بڵێم: "کەروێشک کەلەرم وشک دەکاتەوە، ئاسک ترشیات دروست دەکات، ورچ خواردن دەکاتە قوتووەوە، مێروولەکان دۆشاو دروست دەکەن و دەنووکپانەکانیش نانی تیری هەڵدەچنن" و بتانخەمە پێکەنین، بەڵام نایڵێم. چونکە گشت ئاژەڵانی سروشت، هەر نەبێت هێندەی مرۆڤەکان گرنگی بە زستان دەدەن. بەڵام پەروەرێن تایبەتمەندیگەلێکی جیاوازی بە هەر یەکێکیان بەخشیوە تا بتوانن درێژە بە ژیانیان بدەن. بۆیە تەنانەت ئەوانەشی لە سەختترین بارودۆخدا دەژین، دەتوانن بەسەر گشت ناڕەحەتییەکاندا زاڵ ببن.



- ئەمڕۆ کەشوهەوا کەمێک فێنکە...



## ئاسک

ئاسکەکان وەک ورچەکان هەلی ئەوەیان نییە لە کلۆری دارێکدا یان لە ئەشکەوتێکدا بخەون. (بەو بۆنەیەشەوە پێم وتن ورچەکان چۆن زستان بەڕێ دەکەن!) لەبەر ئەوە زستانیش بەردەوام دەبن لە گەڕان بە دوای خۆراکدا. جگە لەو ڕۆژانەی تۆفانە، هەموو ڕۆژێک بۆ خواردن دەگەڕێن. بێگومان خواردنە خوازراوەکانیان، وەک گژوگیا و میوە و قارچکەکان، لە هیچ لایەکەوە دیار نەماون. هەیە و نییە گەڵا و توێکڵی هەندێک لەو درەختانەیە کە پایزان گەڵاکانیان ناوەرن.




لە کۆتاییەکـــانی زســـتاندا دۆزیـــنەوەی خـــواردن زۆر قـــورس دەبێـت. خـۆ ئەگەر کۆمەڵەکەیـان قەرەبـاڵغ بێـت، ئەوا کاریـان زۆر سەخت دەبێت.

شـــاخی ئاســـکە نێرەکـــان زســـتانان دەوەرن. خـــۆی ئیـــتر لە بارودۆخێکـدا نـین هـیچ ئاسـکێک شـەڕ لەسـەر جـوانترین کچـی کـۆمەڵەکە بکـات. تـاکە دەردی هەمـــوان دۆزیـنەوەی خـواردنە و شـــەڕەکانی ئەم کـــاتە بەگشـــتی لەســـەر تەڵاشـــەدارێک یـــان دوو گەڵای وشک دەبێت.

مانگەکـــانی زســـتان لای ئاســـکەکان بەم جـــۆرە تێـــدەپەڕن. گەرچـی ئاسـکە پیـر و نەخۆشـەکان نەبیـنن، بەڵام ڕۆژێـک دێـت زســـتان تەواو دەبێـــت و لەگەڵ تـــوانەوەی بەفرەکانـــدا، پەروەرێـــن فەرمـــانی "هەســـتەوە!" بە ڕووی زەوی دەدات. گژوگیـــای ســـەوز و میوەی تەڕ و تازە و گوڵ و گوڵزار هەموو لایەک دەتەنن.




بەهـــــار بە هەمـــــوو جوانییەکـانییەوە، لە شـاخ و دەشـت بـار و بـنەی دەخـات. ئاسـکەکانیش چەنـدی حەز بـکەن، سـکی خۆیـان تێـر دەکەن و ئاسـکە نێرەکـان شـاخیان لـێ دەڕوێـتەوە و پـاش مـاوەیەک کۆمەڵێـک بەچـکە ئاسک بۆ کۆمەڵەکەیان زیاد دەبن.



## ئەوانەی پێشوەختە ئامادەکاری دەکەن

یەکێـک لە نمـوونە جوانەکـانی ئەو ئـاژەڵانەی بەر لە هـاتنی زسـتان ئامادەکـاری بـۆ دەکەن؛ دارکـونکەرەیە. دارکـونکەرە بە دەنـووکە تیـژەکەی هەزاران کـون دەکـاتە قەدی درەختەکـانەوە و هەرچـی بنـدق و گـوێزە کـۆی کـردوونەتەوە، لەم کونـانەدا دەیشـارێتەوە. بەڵام بـۆ ئەوەی سـمۆرەکان نەتـوانن لێـی بـدزن، چەنـدی بتوانێـت کونەکـان بچـووک دەکـات تـا بنـدقەکان بەئاسـانی دەرنەیەن. بەهـۆی ئەم هەوڵەوە کە تـا پـاییز درێـژەی دەبێـت، دارکونکەرەکـان لە زسـتاندا کێشەی دۆزینەوەی خواردنیان نابێت.





بێگومان ئاژەڵی دیکەش هەیە لە هاوینەوە ئامادەکاری بۆ زستان دەکات. پشیلەی کێوی و شێری ئەمریکی گۆشتە زیادەکان لە ژێر گڵدا دەشارنەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی زوو تێکدەچن، دەتوانین بەم هەوڵەیان بڵێین: "پاشەکەوتی کورتخایەن".

ورچە جەمسەرییەکانیش ئەو سەگە ئاویانەی ڕاویان دەکەن، لە ژێر تۆپەڵە بەفر و سەهۆڵدا هەڵیاندەچنن. ئەمەش کارێکی قورس نییە، چونکە جەمسەرەکان تەنانەت لە بەفرگرەکانیش ساردترن! بۆیە هەر شتێک هەڵبگیرێت، چەند ساڵێک بێ تێکچوون دەمێنێتەوە.

بەڵام لەبەر ئەوەی ورچە جەمسەرییەکان حەزیان لە گۆشتی بەستوو نییە، بۆیە ناچار دەبن گەشتێکی دوورودرێژ و پڕ زەحمەت بگرنە بەر بۆ دۆزینەوەی سەگێکی ئاوی سەرلێشێواو.




یەکێکی دی لە کۆکەرەوانی خۆراک بۆ زستان؛ جاڵجاڵۆکەیە. وەک دەزانن مێش و مەگەزە بێزارکەرەکانی هاوینان، لە زستاناندا دیار نامێنن. لەبەر ئەوە جاڵجاڵۆکە بەشێک لەو مێش و وردە مێروووانەی بە تۆڕەکانیانەوە دەبن، جوان جوان بە تۆڕەکەیان دایاندەپۆشن، لە شوێنێکی گونجاوی ماڵەکەیاندا هەڵیدەگرن.

هەنگیش، هەمیشە هەزار هێندەی پێویستی خۆی هەنگوین دروست دەکات. دڵنیام باش دەزانیت ئەو هەنگوینە زیادەیە چ سوودێکی هەیە. هەنگەوانەکان هەموو ساڵێک بڕێک هەنگوین لە شانەی هەنگەکاندا دەهێڵنەوە تا لە زستاندا بیخۆن. هەنگی دەشت و دەر و شاخ و داخ بۆ دابینکردنی هەنگوینی زستانیان کار دەکەن. بەڵام ئەمە کارێکی مەترسیدارە، چونکە دەشێت

کەسێکی چاوبرسی یان ورچێکی نەوسن بە یەک جار چی ڕەنجیانە بە بایدا بدات. بەڵام ئەم مەترسییە ڕووبەڕووی ئەو ئاژەڵانە نابێتەوە کە خواردنەکانیان لە چەند جێیەکی جیاوازدا هەڵدەگرن. بەناوبانگترینی ئەم زۆرزانانە؛ سمۆرەیە. سمۆرە بندق و ناوکی سنەوبەر و هەرچییەک بۆ خواردنیان بەکەڵک بێت کۆیان دەکەنەوە و لە شوێنی جیاجیادا دەیاننێژن. بێگومان هەندێکیان شوێنەکانیان بیر دەچێتەوە. ئێستا بە ڕای تۆ، ئەو خواردنانەی نایاندۆزێتەوە، چییان لێدێت؟

بەدڵنیاییەوە دەبنەوە درەخت! هەمان شت بەسەر قەلەڕەشیشدا دێت. ئەوانیش بەشێکی ئەو تۆوە سنەوبەرانەی کۆیان دەکەنەو، لەبیریان دەکەن و بەم جۆرە دەبنە ئەندامێکی خۆبەخشی کەمپینی "تۆش درەختێک بچێنە!"



# لەژێر باراندا



ئەو ڕۆژە کەوتمە بەر بـــاران. لەناکـــاو هەوری چـــڕ و تـــۆخ ئاســمانیان تەنــی و ئاســمانی تاریــک بە چەنــد هەورەبروســکەیەکی یەک لە دوای یەک ڕوونــاک دەبــووەوە. زۆری نەبــرد هەورەگــرمە و بارانێکی بەخوڕ دەستی پێ کرد.

خێــرا خــۆم خزانــدە ژێــر چەتــری دوو کــانێکەوە. زۆری نەبــرد ئـــافرەتێکی بەتەمەن و ســـێ چـــوار گەنجـــی ڕووخـــۆش و پاقلەفرۆشــێکیش هــاتنە ژێــر چەتــرەکە. ڕاســتییەکەی چەتــرەکە هێنـــدە گەورە نەبـــوو هەموومـــان لە بـــارانەکە بپارێزێـــت. بەڵام بـارانەکە هێنـدە بەلێـزمە دەبـاری، کەسـمان نەمانـدەوێرا هەنگاوێـک لەوێ دوور بکەوینەوە.

ناچــار چــاوەڕێ بــووین کەمێــک خــۆش بکــاتەوە. هەر بــاری، هەر بــاری، هەر بــــاری... لە تەنیشـــت شۆســـتەکەوە لافــــاوێکی بچـــــووک هەســـــتا. هەر دوای چارەکێــک بــارانەکە، وەک چــۆن لەناکــاو دەســتی پێ کرد، بە هەمان شێوە لەناکاو خۆشی کردەوە.

هەورە ڕەشــەکان بڵاوەیــان لێکــرد و پڕشــنگی خــۆر و گەرمــی تیشکەکانی ڕوویان تێکردین.

لەگەڵ خۆشـــکردنەوەی بـــارانەکەدا، پشـــیلەیەکی خـــرپن لە کەلێکـــی نێـــوان دوو شـــوقەوە هـــاتە دەرەوە. تووکەکـــانی وشـــک وشـــک بـــوون. ڕاســـتییەکەی مـــن زۆر سەرســـامی پشـــیلەم. لە کەشـــوهەوای گەرمـــدا شـــوێنێکی فێنـــک بـــۆ خۆیـــان دەدۆزنەوە. لە سەرماوسۆڵەشـــدا شـــوێنی گەرم بـــۆ کەس جـــێ نـــاهێڵن. بەم جـــۆرە تەنـــــانەت لە ڕۆژە باراناوییەکانیشـــــدا خێـــــرا خۆیـــــان دەخـــــزێننە کونێکەوە و خۆیان لە تەڕبوون دەپارێزن.





وەک هەمیشـــە کەوتمە بیرکـــردنەوە لە ئاژەڵەکـــانی دیـــکە. لەبەر خـــۆمەوە دەمپرســـی: "تـــۆ بڵێیـــت ئـــاژەڵە دۆســـتەکانی دیکەمـــان، کە لە دەشـــــت و دەر دەژیـــن، لە ڕۆژانـــی باراناویـــدا چـــی بـــکەن؟"



گەڕامەوە بـــۆ مـــاڵەوە و جـــلە خوســـاوەکانم گـــۆڕی و لەســـەر کۆمپیـــوتەرەکەم دانیشـــتم و کەوتمە گەڕان تـــا بـــزانم ئـــاژەڵان لە ڕۆژانی باراناویدا چی دەکەن!

ڕێـــم لە شـــتی هێنـــدە سەرســـوڕهێنەر کەوت، کە ئەگەر بۆتـــانی نەگێـــڕمەوە، دڵم دەتەقێ.



**ڕاکەن! ڕاکەن! ڕاکەن! خەریکە باران دەبارێت!**

باڵنـــدەکان، کە بەگشـــتی لەســـەر لقـــی درەختەکـــان دەژیـــن، لەگەڵ داباریینی باراندا خۆیان دەخزێننە ژێر گەڵایەکی گەورە.

ڕێـوی فێڵبـازیش، هەر کە کـونێکی دۆزیـیەوە خێـرا سـەری پیـا دەکـات. گەرچـی مـاڵی دراوسێکەشـیان بێـت، بـۆ ڕێـوی هەر یەک شتە. کەمێک بێڕوویی لە تەڕبوون باشترە!

مەیمــوونی ئۆرانگۆتــانیش لەبەر ئەوەی ئەو دارســتانە چــڕانەی لێــی دەژیــن درەختــی گەڵا پــانی زۆری لێــیە، گەڵایەکــی گەورە لێــدەکەنەوە و بەســەر ســەریانەوە ڕایــدەگرن. فەرمــوون ئێــوە و چەترێکی سروشتی نایاب.



هەنـدێک ئـاژەڵیش هەن هەڵوێسـتێکی نـامۆی چـاوەڕواننەکراو دەنـوێنن. بـۆ نمـوونە، ئاسـک. ئاسـک، ئـاژەڵێکە ناچـارە هەمیشـە وریـــای دەوروبەرەکەی بێـــت. لە کـــاتی بارانـــدا، لەبەر دەنگـــی بـــارانەکە گوێیـــان لە دەنگـــی پێـــی شـــێر و پڵنـــگ و ڕاوکەری دی نابێـــت گەر لێیـــان نزیـــک ببـــنەوە. بـــۆیە لەبـــاتی ئەوەی خۆیـــان بشـــارنەوە، دەچـــنە شـــوێنێکی کـــراوە تـــا چاویـــان لە دەوروبەری خۆیـان بێـت. بە ڕای ئێـوەش، کەمێـک تەڕ بـبن باشـتر نیـیە لەوەی ببنە ژەمی ئێوارەی خێزانی شێرەکان؟

جۆرێـــک زەرووی ئوســـترالیش هەیە لە کـــاتی بارانـــدا لانەکەی خـۆی -کە لە ژێـر خاکـدایە- جـێ دەهێڵێـت و دێـتە دەرەوە. دواتـر بەســـەر لقـــی درەختێکـــدا هەڵـــدەگەڕێت. دواتـــر لەگەڵ دڵـــۆپە بارانەکانـدا خـۆی هەڵـدەداتە سـەر پشـتی ئەو ئـاژەڵانەی بەژێـر ئەو لـقەدا تێـدەپەڕن. بەم جـۆرە ئـاژەڵەکە -بـۆ نمـوونە، گەر کەنگەرێـک بێـت- هەسـت ناکـات زەروویەک کەوتـووەتە سـەر پشـتی.



ڕۆژانـــی بـــارانی بەلێـــزمە، کـــاتی پیاسەی ئەم زەروو خۆشخۆرانەیە!

دوای بـــارانی بەخـــوڕ جـــۆگەلە و چـــاڵاوی زۆر دروســـت دەبـــن. هەنـدێک جـۆری مێـروولە، بـۆ ئەوەی لەم جـــۆگەلانەدا نـــوقم نەبـــن، پـــێکەوە خـــڕ دەبـــنەوە و خۆیـــان

هاوشێوەی تۆپێک لێدەکەن. تۆپە مێروولەکە لەناو ئاوەکەدا نوقم نابێت و لەگەڵ گوژمی ئاوەکەشدا بەردەوام دەخولێتەوە. بەم جۆرە ئەو مێروولانەی لە ژێرەوەن، دێنە سەرەوە و هەوایەک وەردەگرن. ئەوانەی سەرەوەش، دەچنە ژێرەوە و لەگەڵ سووڕانەوەی تۆپەکەدا جارێکی دیکە دێنەوە سەرەوە. ئیدی ئەو مێروولانەی دەکەونە ژێرەوە ناخنکێن و تا بە شوێنێکی وشکانی دەگەن، بەم جۆرە لەناو ئاوەکەدا دەمێننەوە.

ڕەنگە لە ڕۆژانی باراناویدا کەمێک تەڕ ببیت، بەڵام باران بۆ تەواوی زیندەوەرانی سەر ڕووی زەمین زۆر گرنگە. لەم ڕۆژگارەدا، کە زوو زوو هەواڵی وشکەساڵی لێرە و لەوێ دەبیستین، دەبێت بپاڕێینەوە پەروەردگار بارانی زۆر و بەرەکەتدارمان بەسەردا ببارێنێت. ڕەنگە لە کاتێکی چاوەڕواننەکراودا بکەوینە بەر باران و لە بەریدا بخووسێین، بەڵام ئەمە لە بێئاوی باشتر، وا نییە؟



# کەشوهەوای گەرم کێ بێزار دەکات؟



گەرمە! گەرمە! گەرمە! زۆر گەرمە! دەبێت چی بکەین بۆ ئەوەی فێنکمان بێتەوە؟ پەرداخێک شەربەتی کەللەتەزێنی گەورە بخۆینەوە؟ یان قاپێک دۆندرمە؟ لە هەمووی باشتر ئەوەیە لە ماڵ نەچینە دەرەوە. چی پەنجەرەیە بیکەینەوە و بپارێینەوە خودا شنەبایەکی فێنک هەڵبکات. لە ڕاستیدا من پێم خۆشە لەژێر سێبەرێکی فێنکی درەختێکدا ڕابکشێم. جا ئەگەر شەربەت و دۆندرمەشی لێ بێت، ئەوا باشتر...

لە کەشوهەوای گەرمدا تەماشای دەوروبەرتان بکەن! هەرگیز پشیلەیەک نابینن، چونکە پشیلە چۆن لە سەرماوسۆڵەی زستاندا سووچێکی گەرم بۆ خۆیان دەدۆزنەوە،

بە هەمان شێوە، کاتێک گەرمای هاوینیش بار و بنەی دەخات، سووچ و پەنای سێبەر و فێنک دەدۆزنەوە و لێی پاڵ دەکەون.

ئەی ئاژەڵەکانی دی؟ ئایا دەزانن ئەوان لە کەشوهەوای گەرمدا چی دەکەن؟

هەندێک لە ئاژەڵان، بەتایبەتی ئەوانەی لە بیابانددا دەژین، تەنیا بە شەوان لە لانەکەیان دێنە دەرەوە. چونکە لە بیابانەکاندا شەوان فێنکە. بەڵام هەموو ئاژەڵێک ناتوانێت بە شەو ڕاو بکات. گەر بە شێوەیەکی گونجاو لەگەڵ هەلومەرجەکانی شەودا دروست نەکرابن، ئەوا ناچار دەبن بۆ تێرکردنی سکیان بە ڕۆژی ڕووناک بگەڕێن.

سمۆرەی زەوی، کە لە بیابانە بێ سەروبنەکانی باشووری ئەفریقادا دەژی، کلکە گەورەکەی بەرز دەکاتەوە و بەسەر خۆیدا دەیهێنێتەوە و سێبەر بۆ خۆی دروست دەکات. بێگومان تا دەگاتە سێبەری درەختێکی پارێزراو...

لە بیابانەکان درەختی زۆر کەمی لێیە. ئەوەشی کە لێیەتی درەختی لاواز و باریکە. بێگومان سێبەری ئەم درەختانەش وەک خۆیان باریک و کەمە. بەڵام کەروێشکەکان خۆیان تەواو تەواو دەکشێنن و دەتوانن سوود لەم سێبەر باریکانە ببینن.



وشـــترمرخەکانی ئەفریقــا، بــۆ ئەوەی هێلکەکانیــان لەژێــر تینــی خـــۆردا نەبـــن بە هـــێلکەوڕۆن، بـــاڵە گەورەکانیـــان دەکەنەوە و سێبەریان بۆ دەکەن.

ئـــێمە چـــۆن لەگەڵ هـــاتنی هاوینـــدا پـــاڵتۆ و جـــلە ئەســـتوورەکانمان دەپێچیـــنەوە و جلـــی کـــراوە و تەنـــک لەبەر دەکەیـــن، زۆر ئـــاژەڵیش لەگەڵ کەشـــی گەرم هـــات، تـــووکی

پێستیان دەوەرێت. بۆ نموونە، فیلی ئاوی تووکیان دەوەرێت و تەواوی هاوین لە ڕۆخی دەریایەکدا خۆیان دەدەنە بەر خۆر. بەڵام بۆ ئەوەی پێستیشیان وشک نەبێتەوە، زوو زوو لمی تەڕ دەدەن بە خۆیاندا.

کەرکەدەنەکانیش لە قوڕ و لیتەدا پاڵ دەکەون و هەموو گیانیان بە قوڕ دادەپۆشن. لەگەڵ ئاوی نێو قوڕەکە دەبێت بە هەڵم، پێستی کەرکەدەنەکانیش فێنک دەبێتەوە.

گوێیە گەورەکانی فیلەکان بۆ فێنکبوونەوە زۆر بەکەڵکن. فیل گوێیەکانی وەک باوەشێن ڕادەوەشێنێت و شنەیەک لە دەوری خۆیان دروست دەکەن. گوێیەکانی فیل مووڵوولەی زۆر وردی تێدایە. کاتێک خوێن بەم مووڵوولانەدا تێدەپەڕێت، گەرمی دەداتەوە. بەم جۆرە پلەی گەرمیی جەستەیان دادەبەزێت. ڕێگایەکی دی کە فیلەکان بۆ خۆفێنککردنەوەیان دەیگرنە بەر، ئەوەیە بە لووتیان ئاو بەسەر یەکدا دەپرژێنن. وا بزانم ئەمە لە هەموویان خۆشترە! بەتایبەتی بۆ بەچکە فیلەکان!



بزنی کێوی بەختیان زۆرە. لەگەڵ گەرمبوونی کەشوهەوادا دەچنە سەر لوتکەی چیاکان و لەسەر بەفرە نەتواوەکەی سەر لووتکەکان ڕادەکشێت. ئەمە وەک ئەوەیە قاپە دۆندرمە بکەیت بەسەر خۆتدا!

با بێینە سەر باسی ورچ... بەڵێ، کەمێک توو کیان لێ دەوەرێت، بەڵام خۆ پێستیان هەر ئەستوورە. ناچار دەگەڕێن بۆ بەرزترین درەخت و دەچنە سەر بەرزترین لقێک کە بتوانێت ڕایانبگرێت و خۆیان دەدەنە بەر شنەبا.

وەک دەبینن لە جیهانی ئاژەڵاندا، بۆ هەر ئاژەڵێک ئاسانکارییەک کراوە. ڕەنگە پەرداخە شەربەتیان بۆ نەخورێتەوە و تامی دۆندرمەیان نەکردبێت، بەڵام لە گەرما و سەرمادا بێ نارەزایەتی دەربڕین بە خۆشی و شادی دەژین.

- کاکە! کاکە! وەرە لێرە فیلێکی لێیە با بیترسێنین!

- گوناحە، لێی گەڕێ!



# باڵندەی شەوان: کوندەپەپوو



هەر کە خـــۆر تیشـــکە ئاڵتوونییەکـــانی پێچـــایەوە و لە پشـــت لـــووتکە دوورەکانـــدا دیـــار نەمـــا، ئیـــدی شـــەو دادێـــت. ئاســـمان بە پەردەیەکـــی ڕەش و ئەســـتێرەی هاوشـــێوەی دەنـــکە ئەڵماســـی ورد دادەپۆشرێـــت. زۆر دەنـــگ و ژاوەژاوی ڕۆژ، شـــوێنی خۆیـــان بـــۆ بێـــدەنگی جـــێ دەهـــێڵن. مرۆڤەکـــان، بەرخەکـــان، پشـــیلەکان، چۆلەکەکـــــان و کۆترەکـــــان دەخەون... بەڵام کونـــــــدەپەپوو ناخەوێـــت، چـــونکە بـــۆ کونـــدەپەپوو ژیـــان لە شـــەودا دەســـت پـــێ دەکات.

ئەگەر لە نیـــوەی شـــەودا لەناکـــاو خەبەرتـــان بێـــتەوە و خەو لە چاوتـــان بزڕێـــت، ئەوا بەوریـــایی گـــوێ بـــۆ دەوروبەرتـــان هەڵـــبخەن. دەشـــێت لە نێـــوان لقەکـــانی درەختێکـــی نزیـــک ماڵتـــانەوە، یـــان لە کەللاوەیەکی کۆنی چۆڵدا گوێتان لە دەنگێکی لەم جۆرە بێت:

- هو هو! هو هو! هووووو! هووووووو!

نەترسـن! ئەمە دەنگـی کونـدەپەپووە. دەنگـی کونـدەپەپوو نە بەخـت دێنێـت، نە بەخـت دەبـات. ئەمە تەنیـا چـریکەی باڵنـدەیەکە، کە ئەگەر بیناسـن، سەرسـامی دەبـن. منـداڵەکان، بـاوەڕ بـکەن کونـدەپەپوو باڵنـدەیەکی زۆر نـاوازەیە. کە لە خوێنـدنەوەی ئەم بەشـە بـوونەوە، بـزانن لەگەڵـم هـاوڕا دەبـن، یـان نا!

وسسسسس! بەڵام ئێستا بێدەنگ بن، تکایە. گوێتان لێیە؟

هو هو! هو هو! هووووو! هووووووو!

ئەوە کوندەپەپوویەکە وا دەخوێنێت.

## پەڕ و باڵ

گـرنگترین شـت بـۆ هەر باڵنـدەیەک کە لە شـەواندا ڕاو بکـات، ئەوەیە بە بێـدەنگی لە نێچیـرەکەی نزیـک ببێـتەوە. بەتـایبەتی ئەگەر بە دوای ئـاژەڵی هەسـتیار و چسـت و چـالاکی وەک کەروێشـک و مشکەوە بێت، ئەوا دەبێت هەر زۆر بێدەنگ بێت.

کونـدەپەپوو لە بـابەتی بێدەنگیـدا هاوشـانی نیـیە. هـیچ باڵنـدەیەک هێنـدەی کونـدەپەپوو بەخشـپەیی نافڕێـت. بـۆ نمـوونە،



قــاز لە دووریــی چەنــد مەتــرێکەوە دەنگــی باڵیــان دێــت. بەڵام پەروەردگــار بــاڵێکی زۆر تــایبەتی بە کونــدەپەپوو بەخشــیوە تــا بەبێــدەنگی بفڕێــت. پەڕەکــانی لێــواری باڵەکانیــان وەک دەمــی مشــار گــرنجن. بەم جــۆرە بــا بەبێــدەنگی بەســەر باڵەکانیانــدا دەخشــێت و کونــدەپەپووەکەش وەک خێوێک بەسەر نێچیرەکەیدا دەدات و دەیگرێت.

وەک دەزانـــن شـــەو لە ڕۆژ ســـاردترە. بەڵام پەڕەکـــانی کونــدەپەپوو هێنــدە ئەســتوورن کە هەرگیــز ســەرمای نابێــت. ئەم پەڕانە تەنیــا ڕۆڵــی پــاڵتۆیەکی ئەســتوور نــابینن، بەڵکــو لە هەمــان کاتــدا بەهــۆی ڕەنــگە تایبەتەکەیــانەوە لەنێــو لــق و پــۆپی درەختەکانــدا بەئاســانی نــابینرێن و نێچیــر و دوژمنەکانیــان درکیــان پێناکەن.

بــۆ نمــوونە، پەڕی کونــدەپەپووی بەفــر ســپییە. هــیچ کونــدەپەپوویەکی ســپی دەناســن؟ بــۆ نمــوونە، هێــدویگی کوندەپەپووەکەی هاری پۆتەر!







جگە لەوەش، لە پشتی سەریانەوە دوو خاڵیان هەیە لە چاو دەچن. ئەم خاڵانە بۆ ئەوەن، هەرچییەک ویستی لە دواوە لێیان نزیک ببێتەوە، لێیان بترسێت.

کاتێک ئاژەڵێک بیەوێت هێرش بکاتە سەر بەچکە کوندەپەپووەکان، خۆیان گیف دەکەنەوە و دەیترسێنن. پەڕەکانیان هێندە دەکەنەوە، کە سێ چوار هێندەی قەبارەی خۆیان گەورەتر دەردەکەون. پاشان ئەو چاوە گەورانەشیان زەق دەکەنەوە و هەر بەڕاستی دیمەنێکی زۆر ترسناک و سەرسوڕهێنەریان دەبێت.

## چاوە گەورەکان

یەکێک لە تایبەتمەندییە ناسراوەکانی کوندەپەپوو؛ چاوە گەورەکانیەتی.



بەڵێ، چاوی هەندێک کوندەپەپوو لەچاو جەستەیاندا زۆر گەورەیە. ئەگەر چاوی ئێمە لەچاو جەستەماندا هێندەی چاوی کوندەپەپوو بووایە، ئەوا هەر چاوێکمان هێندەی پرتەقاڵ یان سندییەک دەبوو. ئەم چاوە گەورانە بۆ ڕاوکەرێکی شەوان ئێجگار پێویستن.

زۆربەی باڵندەکان چاویان لەملا و ئەولای سەریانەوەیە. بەڵام چاوی کوندەپەپوو لە ڕووی پێشەوەیە. بەم جۆرە تەماشای هەرجێیەک بکەن، ١٠ هێندەی ئێمە باشتر دەبینن.

کوندەپەپوو ناتوانێت بیلبیلەی چاوەکانی بۆ لای ڕاست و چەپ یان بۆ سەرەوە و خوارەوە بسووڕێنێت. دەی باشە، چۆن ڕاست و چەپی خۆیان دەبینن؟ ملی کوندەپەپوو هێندە زۆر دەسووڕێتەوە کە تەنیا بە سووڕانی سەریان دەتوانن پشتی خۆیان ببینن.

## چاوت نەترووکێنیت!

وەک لە باسی چاوداین، با زانیارییەکی زۆر سەرسووڕهێنەرتان پێ بڵێم، کە ڕەنگە پێشتر هەرگیز نەتانبیستبێت.

مـرۆڤ لە هەر خولەکێکـدا نـزیکەی ٢٠ بـۆ ٣٠ جـار چـاوی دەتروکێنێـت. ئەمە بـۆ شـێدارکردنەوە و پاراسـتنی چاوەکـان زۆر پێویسـتە. لە کـاتی چاوتروکاندنمانـدا بـۆ مـاوەیەک، گەرچـی زۆر زۆر کەمـیش بێـت، چاومـان لە بینـین دەکەون. ئەمە بـۆ ئـێمە شـتێکی هێنـدە گرنـگ نیـیە. بەڵام بـۆ کونـدەپەپوویەک کە دوای نێچیرێکـی خێـرا کەوتـووە، زۆر گـرنگە و نابێـت هەرگیـز چـاوی بتروکێنێت.

## باشە، کەوایە کوندەپەپوو هەرگیز چاوی ناتروکێنێت؟

هەم کونــــدەپەپوو، هەم باڵنــــدەکانی دیــــکەش چاویــــان دەتـروکێنن. بەڵام پەروەرێـن پێڵـوویەکی دیـکەی بەوان بەخشـیوە کە پێـی دەوترێـت: "پێڵـووی چاوتروکانـدن" و ئەم پێڵـووە تـایبەتە ڕوونە، واتە وەک شووشـــە وایە. بەم جـــۆرە باڵنـــدەکان تەنـــانەت کـاتی چاوتروکانـدنیش پێشـی خۆیـان هەر دەبیـنن. جـگە لەوەش، ئەم پێڵـووە بـۆ ئەو باڵنـدانەی سـەر دەکەن بە ژێـر ئـاودا و ماسـی دەگرن، وەک چاویلکەی مەلەکردنی ئێمە وایە بۆیان.

چۆنە! بەڕاستی سەرسوڕهێنەر نییە؟

# پاسەوانانی شەو

وا بـزانم ناوبـانگی شـوومیی کونـدەپەپوو کان تەنیـا بەهـۆی دەنـگە ترسـێنەرەکەیانەوە نیـیە. ڕەنـگە ئەم ناوبـانگە خراپەیـان بەهۆی ئەوەوە بێت کە لەگەڵ مرۆڤدا بەوەفا نین.

لە ڕاسـتیدا کونـدەپەپوو وەک پاسـەوانی شـەوان، لەگەڵ تـاریکی داهـات تـا بەیـانی لە مشـک و جـرج و هەرچیـیەک کە ڕەگ و لقـی ڕووەک و دانەوێڵەکـان دەخـۆن؛ ببیـنن، خێـرا ڕاوی دەکەن و ڕێ لە زۆربوونیـان دەگـرن. بەم جـۆرە کـێڵگە و باخچەکانمان شەوان لەژێر چاودێری کوندەپەپووەکاندان.

وسسس! دەیبیستن!

هو هو! هو هو! هووو! هوووو! ئەوە کونپەپووە!

هێشتاش دەترسن؟

وا نازانم.



# دۆڵی گورگان




ئەمڕۆ دەمەوێت باسی گورگتان بۆ بکەم. گورگی دۆڵ و دەشت و چیاکان. ئەوانەی بەنێو دارستانەکاندا دەگەڕێن. ئەوانەی لە دۆڵە تاریکەکاندا خۆیان مەڵاس دەدەن. ئەوانەی لەگەڵ دەرکەوتنی مانگی چواردەدا دەچنە سەر گردۆڵکەیەک و ڕووبەڕووی ماڵی مرۆڤەکان دەلوورێنن:

ئوووووووووووو! ئوووووووووووو!

ئیتر منداڵەکانیش لە خەو ڕادەپەڕن و توند باوەش بە بەتانییەکەیاندا دەکەن و دەکەونە پاڕانەوە. سەگە چاونەترسەکانی بەر دەرگاش ددانەکانیان جیڕ دەکەنەوە و تەماشای ئەملا و ئەولایان دەکەن. مەڕ و بزنی تەویلەکان لە

ترسـاندا چاوەکانیـان زەق دەبـنەوە. کلکـی گوێـدرێژیش وەک شەقشەقە دەکەوێتە لەرزین.

ئوووووووو... ئووووووووو!

گـورگ دەلوورێنێـت. کە گـورگیش لوورانـدی، هەمـووان دەترسن.

ئایـا بەڕاسـتی گورگەکـان وەک باسـیان دەکەن، هێنـدە ترسناکن؟ پێتان چۆنە کەمێک لە نزیکترەوە بیانناسین؟

تا زانیـاریی کەمترتـان دەربـارەی ئاژەڵێـک هەبێـت، هێنـدە زیـاتر لەو ئـاژەڵە دەترسـن. گەر ترسـتان لە گورگەکـان هەیە، ئەوا دەبێـت لە نـزیکەوە بیانناسـن تـا بەسـەر ئەو ترسـەتاندا زاڵ بـبن. دوای تەواوکردنـی ئەم بەشـە، دڵنیـام ئیـتر گـورگ بە گیانـدارێکی وا ترسناک نابینن، کە بترسن وەک داپیرەی کڵاوسوور بتانخوات.

## خێزانی گورگ

گـورگ -وەک مرۆڤەکـان- لە خێزانێکـی گەورەدا دەژیـن، لە دایک و باوک و کۆشێک منداڵ و داپیرە و باپیرە پێکدێت...



ئەنــدامانی خێــزانەکە پەیوەنــدییەکی بەهێــز لە نێوانیانــدایە و زۆر ڕێــزی یەک دەگــرن. بەچکەکــان لەگەڵ یەک یــاری دەکەن و گەورەکــانیش پــێکەوە ڕاو دەکەن. پارێزگــاری لە یەکــتری دەکەن. شێوازی ژیانی خێزانی گورگ لە هی مرۆڤ دەچێت.

ئێســتا بــا کەمێــک لە نــزیکەوە تەماشــایان بکەیــن، بــزانین چــی دەبینین؟

## گەورەی کۆمەڵەکە: دایک و باوک

هەمــوو خێزانێکــی گورگەکــان دوو گەورەیــان هەیە. پێیــان دەوترێــت ئەلفــا. ئەلفاکــان دایــک و بــاوکی کۆمەڵەکەشــن. تەواوی بەچکەکــان نەوەی ئەوانــن. گەر یەکێــک لەم دووانە بمرێــت، ئەوا ئەوی دیکە هاوسەرێکی نوێ بۆ خۆی پەیدا دەکات.

## ژووری منە، دوور بکەونەوە!




زۆرتـان پێناخۆشـە یەکێـک بـێ مـۆڵەت خـــۆ بکـــات بە ژوورەکەتانـــدا، وایە؟ بە هەمان شێوە، گەر بـێ مـۆڵەت خـۆ بـکەن بە ژووری دایــک و باوکیشــتان لێتــان تــوورە دەبــن. گورگەکــانیش نــاوچەی تــایبەتی خۆیــان دیــاری دەکەن. چــوونە نێــو ئەم ناوچانــانە بە هەمــوو شــێوەیەک قەدەغەیە. دەزانــن گورگەکــان چــۆن بە کۆمەڵەکــانی دیــکە ڕادەگەیەنـن کـامە نـاوچەی خۆیـانە؟ بە میزکــردن! بەڵــێ، میــز بە قەدی درەختێــک یــان بەردێکــدا دەکەن و بەم جــۆرە گورگەکــانی دیــکە ئەو نــاوچەیە دەناســنەوە و لێــی نزیــک نــابنەوە، چــونکە گورگەکــان لەو ناوچــانەدا بێچووەکانیــان بەخێو دەکەن، یاخود ڕاویان تێدا دەکەن.

## منداڵ بەڕێوەیە!

ئەوەی خوشــک و بــرای بچــووکی هەبێــت بــاش دەزانێــت. بەر لەوەی منــداڵی تــازە بێــتە دنیــاوە، ســەرەتا کۆڵێــک ئامادەکــاری بــۆ

دەکرێت. جێیەکی تایبەتی بۆ دەکردرێت. ژووری بۆ دەڕازێنرێتەوە...

گورگی دایکانەش بەر لەوەی بەچکەکانی بێنە دنیاوە، سەرەتا لانەیەکی گەرم و پارێزراویان بۆ ئامادە دەکات. زۆر کات گورگە دایکانەکە لانەیەکی بەدڵ نابێت و دەچێت بۆ لانەیەکی دیکە دەگەڕێت. تا لانەیەکی باش دەدۆزیتەوە، لە گەڕان بەردەوام دەبێت.

## گووووورگی بەڕێز، چ باشتر هاتیتە دنیاوە!

کاتێک بەچکەکە دێتە دنیاوە، دایکەکە ناهێڵێت هیچ کەس لێی نزیک ببێتەوە، بە باوکەکەشەوە. گەر باوکەکە حەز بکات بەچکەکەی ببینێت و لێی نزیک ببێتەوە، دایکەکە ددانەکانی جیڕ دەکاتەوە و مۆڕەی لێدەکات. وەک ئەوەی پێی بڵێت: "لەگەڵ منداڵەکەمدا بەتەنها جێمان بهێڵە."

گورگە باوکانەکە تێدەگات بۆچی دایکەکە وا دەکات. دایکەکە زۆر شەیدای بەچکەکانیەتی. بۆ یەک ساتیش لێیان دوور ناکەوێتەوە. بۆیە باوکەکە دڵگران نابێت. دەچێت ڕاو دەکات و خواردنی پێویست بۆ دایکەکە دێنێتەوە و سکی دایکەکە تێر دەکات.




پاش ماوەیەک دایکەکە منداڵەکان لای باوکیان جێ دەهێڵێت و دەچێت بۆ ئاوخواردنەوە و خۆشۆرین. دایکەکە بەوردی چاودێریی پاکوخاوێنی منداڵەکانی دەکات و تووکەکانیان دەلێسێتەوە و دوای پیسایکردنیان، خاوێنیان دەکاتەوە.

## ئاهەنگی بەچکە گورگ

دوای پێنج شەش هەفتە ئیدی کاتی ئەوەیە بەچکە گورگەکان لە کولانەکان بێنە دەرەوە. گورگە باوکانەکە و ئەندامەکانی دیکەی خێزانەکە کلکیان ڕادەوەشێنن و بەخۆشحاڵییەوە پێشوازی لە بەچکەکان دەکەن. هەمووان دەیانلێسنەوە. کاتێک تۆش خوشک و برا بچووکەکانت هاتنە

دنیاوە، لە ماڵی خۆتان ئاهەنگی پێشوازیتان بۆ گێڕان؟ تەماشا! چەندە لایەنی هاوبەشمان لەگەڵ ئەم گورگە دڕندانەدا هەیە.

بەچکە گورگەکان هێشتا توانای ڕاوکردنیان نییە. ئەرکی خێزانەکەیە خواردنیان بۆ بهێنن. بەتایبەتی باوکەکە. باوکەکە نێچیرەکەی پارچە پارچە دەکات و لەپێش بێچووەکانی دایدەنێت. هەندێک جاریش گۆشتەکە دەجووێت و دەیکات بە دەمی بەچکەکانییەوە. بێگومان خواردنی گۆشتی جووراو بۆ بەچکەکان ئاسانترە. وەک ئەوەیە شفتە بخۆن.

کاتێک دایک و باوک دەچن بۆ سەر کار -یان ڕاستترە بڵێم کە دەچن بۆ ڕاو- بەچکەکان بە ئەمانەت لای ئەندامێکی خێزانەکە جێ دەهێڵن.

بەچکەکان کە گەورەبوون، ئیدی کاتی ئەوەیانە فێری ڕاوکردن ببن. دەیانبەن بۆ ڕاو، بەڵام چاودێرێکیشیان بە دیارەوە دەبێت. دەشێت خوشک و برا گەورەکانیان یان داپیرە و باپیرەیان چاودێرییان بکەن.

هەر کات بە تەواوی گەورەبوون و پێگەیشتن، ئیدی کاتی ئەوەیە لە لانەکەیان دوور بکەونەوە. ئەم بەچکانە ئیدی لە خێزانەکەیان دادەبڕێن و دەگەڕێن هاوسەرێک بۆ خۆیان پەیدا بکەن. هەندێکیان بۆ شوێنێکی نزیک لە خێزانەکەیان دەچن و هەندێکیشیان سەدان کیلۆمەتر دوور دەکەونەوە.

ژیـانی خێزانیـی گورگەکـان بەم جـۆرە تێـدەپەڕێت. ئـێمەش لەبەر ئەوەی لە دوورەوە تەماشـایان دەکەیـن، بە گیانـدارێکی درنـدەیان دەزانـین. بەڵـێ، گـورگ ئـاژەڵێکی مەترسـیدارە. بەتـایبەتی کاتێـک برسـی دەبێـت زۆر بێبەزەیـیە، چـونکە ناچـارن سکی خۆیان و لەوەش گرنگتر سکی بەچکەکانیان تێر بکەن.

لە هەلـومەرجی ئاسـاییدا، گـورگ گۆشـتی ئـاژەڵی مردارەوەبوو دەخوات، یان ئاژەڵی بریندار و لاواز ڕاو دەکات.

بەڵام لە ڕۆژە سـەختەکانی زسـتاندا، کاتێـک خـوارن کەم دەبێتەوە، ئیدی تەنانەت ئامادەن بێن بۆ نێو لادێکانیش.

ئووووووووو! ئووووووووو!

ئەوە ئێوەش گوێتان لەو دەنگە بوو؟ ئەوە دەنگی گورگە.

هممم، هینە! دەڵێم با ئیتر من بڕۆم باشە!

# ئەو پشیلە سەرسوڕهێنەرانە



لە سـەدەی شـانزەیەمی زایینیـدا، شـاعیرێک بە نـاوی مەعـالی پشـیلەیەکی هەبـووە زۆری خۆشویسـتووە. ڕۆژێـک پشـیلەکەی مـردووە. هێنـدە بە مر دنـی پشـیلەکەی دڵتەنـگ بـووە کە هـۆنراوەیەکی دوورودرێـژی بەناونیشـانی لاوانـدنەوەی پشـیلە، نووسیوە.

ئەم هـۆنراوە دوورودرێـژە، لەبەر ئەوەی بە زمـانی ئەو سـەردەمە نـووسراوە، لە ئێسـتادا بەئاسـانی لێـی تێنـاگەین. بەڵام چەنـد بەیتێکـی هـۆنراوەکەی زوو زوو لەنێـو خەڵکـدا دەوتـرێتەوە و لەو چەنـد بەیـتەوە هێنـدە جـوان تێـدەگەین مەعـالی چەنـدێک بۆ پشیلەکەی دڵتەنگ بووە.

لە منداڵیمـدا پشـیلەی زۆرم هەبـووە. بە ڕای مـن، گەر منـداڵێک پشـیلەی نەبێـت کەموکـوڕییەکی هەیە. بە ڕای مـن، دەبێـت هەمـوو منـداڵێک بەچـکە پشـیلەیەکی شـیرین لە بـاوەش

بگرێت و دەست بە سەریدا بهێنێت و لەگەڵ خۆیدا بیخەوێنێت. دەبێت گوێی لە پرخەپرخە شیرینەکەی بێت و دەست بە بنەپێی پەمەییەکەیدا بێنێت. دەبێت بە زمانە گرنجگرنجەکانی دەستی بلێسێتەوە. تەنانەت دەبێت هەندێک جار پشیلەکە چڕنووکی لێ بخشێنێت و بەم جۆرە فێری ڕێزگرتن لە ئاژەڵان ببێت. (تێبینییەکی گرنگ: گەر پشیلەیەک چڕنووکی لێ خشاندن و نەتاندەناسی، ئەوا دەبێت خێرا بە دایکتانی بڵێن، چونکە هەندێک پشیلە نەخۆشن و دەشێت نەخۆشییەکەیان بۆ تۆ بگوازرێتەوە.)

بەڵێ، من لە پشیلەکەمەوە فێری زۆر شت بووم. گومانی تێدا نییە منیش لەملا و ئەولا هەندێک شتم فێری پشیلە کردووە، بەڵام بەگشتی شتی گرنگ نەبوون.

گرنگترین شتێک لە پشیلەوە فێربوو بێت ئەوەیە هەرگیز ناتوانم ببمە خاوەنی پشیلە!



دەزانــــم ســــەر تان ســــوڕماوە. بینیوتــــانە خەڵکــــی پشــــیلەیان هەبێــــت، تەنــــانەت ڕەنــــگە خۆشــــتان هەتانبێــــت. بــــۆیە دڵنیــــام بەپەرۆشن بزانن خێرە وا ناتوانم ببمە خاوەنی پشیلە.

تەنــانەت ڕەنــگە یەکێــک لە ئێــوە ئێســتا بڵێــت: "پشــیلەکەم وا ئێستا خۆی لە قاچم دەخشێنێت! دەی ئەمە واتا پشیلەی منە!"

خــــۆی لە قاچەکانتــــان دەخشــــێنێت، وایە؟ دەی تەواوە! ئەمە دەریــدەخات مــن ڕاســت دەکەم، چــونکە کاتێــک پشــیلە خــۆی لە شــتێک دەخشــێنێت، بــۆنی خــۆی پێــوە جــێ دەهێڵێــت. ئەمەش لە جیهانی پشیلەکاندا واتا:

"ئەم شتە هی منە!"

پشــیلەکەتان هێشــتا لەبەر قاچتانــدایە؟ لێــی گەڕێــن بــا خۆیتــان لــێ بخشــێنێت. هەرگیــز نــاتوانن خــووی پشــیلە بگــۆڕن. ئەمە دووەم گرنگترین شت بوو کە لە پشیلەوە فێری بووم.

## یەک دوو تێبینی لەسەر مێژووی پشیلە

لە میســری کۆنــدا پشــیلە ئــاژەڵێکی زۆر گرنــگ بــووە. مســرییە کۆنەکــان هێنــدەیان زیــادەڕەوی لە خۆشەویســتی پشــیلەدا کــردووە، کە لە نەزانیــی خۆیــانەوە وایــان زانیــوە بــوونەوەرێکی پیــرۆزە. وەک



فیرعەونەکـــان، هەر پشـــیلەیەک بمـــردایە، مۆمیایـــان کـــردووە و لە گۆڕسـتانێکی تایبەتـدا ناشـتوویانە. وا بـزانم پێویسـت ناکـات بڵـێم پشیلەکانی ئەو سەردەمە چەندە لە ژیانیان ڕازی بوون.

بەڵام نێـوانی مرۆڤەکـان و پشـیلەکان هەمیشـە وا ڕێـک نەبـووە. لە باسـی نەزانیـدا هـیچ کەسـێک شـان لە شـانی ئەوروپییەکـانی سـەدەی ناوەڕاسـت نـادات. پشـیلەش پشـکی خـۆی لەم نەزانییەیـانەوە وەرگرتـووە. بە بـڕوای پیـاوانی ئـایینی ئەو سـەردەمە، پشـیلە شـووم بـووە. ڕاوێکـی گشـتی پشـیلە لەو ئەوروپـا فـراوانەدا دەسـتی پـێ کـردووە. چـی پشـیلەیە کوشـتوویانە. پـاش مـاوەیەک خەریـک بـووە پشـیلەکان بەتەواوی لەنـاو بچـن. سـزای ئەم ستەمکارییەشـیان هەر ڕێـک لە دوای ئەم کارەیـان وەرگرتـووەتەوە. لەگەڵ کەمبـوونەوەی ژمـارەی پشـیلەکاندا، ژمـارەی مشـکەکان زیادیـان کـردووە. شـارەکان وایـان لێهـاتووە لەبەر مشـک ژیـانی تێـدا نەمـاوە. پـاش مـاوەیەکی کەم لە ئەوروپـا پەتـایەکی درم سـەری هەڵـداوە. بەهـۆی مشکەکانیشـەوە پەتـاکە هێنـدە بەخێرایـی بڵاوبـووەتەوە کە زیـاتر لە نیـوەی دانیشـتوانی ئەوروپا بەهۆی نەخۆشییەکەوە مردوون.

بـا چیـتر لاپەڕە کۆنەکـانی مێـژوو هەڵنەدەیـنەوە و چەنـد زانیارییەکتـان دەربـارەی پشـیلەکان پـێ بڵێـین. ئێهـ وا توانیتـان دڵـی دایـک و باوکتـان ڕازی بـکەن و پشـیلەیەک بکـڕن بە کەڵتـان



دێــــت. (بەڵام هەرگیـــز لەبیـــری نەکەن، بەر لەوەی بڕیـــاری بەخێـوکردنی ئاژەڵێـک بـدەن، سـەرەتا دڵنیـا ببـنەوە لەوەی ئەو شوێنەی لێی دەژین بۆ بەخێوکردنی ئەو ئاژەڵە گونجاوە یان نا.)

## بۆچی پشیلەکان کەلوپەلەکان دەڕووشێنن؟

سـەرەکیترین سـکاڵای خەڵکـی لە دەسـت پشـیلەکان ئەوەیە، چـی کەلـوپەلی نـاو مـاڵەکەیە دەیڕووشـێنن. خـۆی بنچیـنەی باسەکە بەم جۆرەیە:

پشـیلە هـیچ کـارێکی بەسـەر قەنەفە و فەرش و هـیچ شـتێکی دیـکەی ئێـوەوە نیـیە. بەڵام پشـیلە ناچـارە چڕنووکەکـانی بەکـار بهێنێـت. لەبەر ئەوەی دەبێـت شـتێکی بـۆ پەیـدا بـکەن تـا بیڕووشێنێت.

بە هەمـان شـێوە، پشـیلە دەبێـت ڕاهێنـان بکـات و ماسـولکەکانی بخـاتە گەڕ. پشـیلەیەکیش بەردەوام لە مـاڵەوە بـژی، تـاکە ڕێـگە بـۆ ڕاهێنـانکردنی ئەوەیە کەلوپەلەکـان هەنجـن هەنجـن بکـات. لەبەر ئەوە گەر ویسـتتان پشـیلەیەک بکـڕن بـا باخچەیەکتان هەبێت بتوانێت تێیدا یاری بکات.

هۆکـارێکی سـەرەکیی دی کە پشـیلەکان کەلـوپەل دەڕووشـێنن، ئـارەزووی جێهێشـتنی جێدەسـتیانە بە شـتەکانەوە.

بەم جـۆرە دەیانەوێـت نیشـانی بـدەن کە ئەو شـتە هـی ئەوانە. واتە وازۆی لەسـەر دەکەن. جـگە لەوەش، بنەپێـی پشـیلەکان بـۆنێکی لێـدێت. کاتێـک دەسـت بە شـتێکدا دەهێـنن، ئەو بۆنەشـی پێـوە جێ دەهێڵن. ئەمەش واتا:

"مەستانی پشیلە لێرەیە، تکایە لێرە دوور بکەونەوە!"

## بۆچی پشیلە دەمرخێنێت؟

مرخەمرخـــی پشـــیلە بەناوبـــانگە. ئەم مرخەمرخەیـــان وەک چـــۆن شـــێوازێکی قســـەکردنی نێوانیـــانە، بە هەمـــان شـــێوە، ئامرازێکی پەیوەندیکردنیانە بە مرۆڤەکانیشەوە.

زۆر کـــات پشـــیلە کە خـــواردنێکی خـــۆش دەخـــوات، دەمرخێنێـت. بـۆ نمـوونە، پشـیلەیەکی خـرپن گەر ماسـییەکی خـۆش بخـوات، دواتـر دەچێـتە گەرم و نەرمـترین شـوێنی مـاڵەکە و دەسـت بە مرخەمـرخ دەکـات. کـێ دەزانێـت؟ ڕەنـگە بەم جـۆرە سوپاســی پەروەردگــاری بکــات کە ڕۆزییەکــی وا خۆشــی پــێ بەخشیوە.

ئەگەر بەچـکە پشـیلەیەک لە باوەشـتاندا دەسـتی بە مرخەمـرخ کـرد، ئەوە واتـا کەیفـی سـازە. جـگە لەوەش، بەچـکە پشـیلەکان

لەبەر ئەوەی گوێیەکانیـــان بـــاش نابیســـتن، تەنیـــا هەســـت بە لەرینەوەکـــانی مرخەمرخـــی دایکیـــان دەکەن. بەم جـــۆرە تێـــدەگەن دەوروبەرەکەیان هێمن و ئارامە.

## بۆچی چاوی پشیلە بە شەوان دەدرەوشێتەوە؟

لە ڕاســـتیدا درەوشـــانەوەی چاوەکانیـــان پەرچـــدانەوەی ئەو ڕوونـــاکییەیە کە بەر چاویـــان دەکەوێـــت. لەبەر ئەوەی لە چـــاوی پشـــیلەدا لە پشـــت تـــۆڕەی چاویـــانەوە تـــۆڕێکی هاوشـــێوەی ئـــاوێنە هەیە، بـــۆیە گەر ڕاســـتەوخۆ تەماشـــای چاوەکانیـــان بـــکەن، هەســـــت بە درەوشـــــانەوەی چاوەکانیـــــان دەکەن. بەهـــــۆی پەرچـــــدانەوەی ڕوونـــاکییەوە جـــارێکی دیـــکە بە تـــۆڕەی چاویانـــدا تێـــدەپەڕێتەوە و بەم جـــۆرە پشـــیلە لە شـــوێنە مەیـــلەو تاریکەکانـــدا لە مـــرۆڤ باشـــتر دەبینێـــت، بەڵام لە شـــوێنی تاریکدا ئەوانیش هیچ نابینن.



## بۆچی کاتێک پشیلە بۆنێک دەکات، ڕووخساری دەگۆڕێت؟

لە مەلاشـــووی پشـــیلەدا ئەنـــدامێکی تـــایبەتی بـــۆنکردن هەیە. هەر کاتێـک دەمـی کـردەوە و لێـوی سـەرەوەی هەڵبـڕی، ئیـدی لە ڕێی ئەم ئەندامەوە بەئاسانی بۆنی شتەکان دەکات.

## بۆچی پشیلە ئاژەڵی مردارەوەبوو دێنێتەوە؟

گەر پشـــیلەکەتان جارێـــک باڵنـــدەیەک یـــان مشـــکێکی مردارەوەبـــووی لەگەڵ خۆیـــدا بـــۆ هێنـــانەوە، ئەوا دەیەوێـــت پێتـــان بڵێت: "ڕەنگە برسیت بێت، ئەمەم بۆ تۆ هێناوە!"

پشـیلە گیانـدارێکی هاوکـاریخوازە. تەنـانەت ڕەنـگە مرۆڤەکـان بە بـــوونەوەرگەلێکی لاواز و بێدەســەڵات ببیـنن بـۆیە دەیانەوێـت هاوکارییان بکەن.





# بۆچی پشیله خۆی دەلێسێتەوە؟

یەکێـــک لە نـــاسراوترین تایبەتمەنـــدییەکانی پشـــیلە ئەوەیە هەمیشـــە پاکوخـــاوێنن. گەر لە کـــۆڵانیش بـــژین، هەرگیـــز بەپـــیس و چەپەڵـــی نـــاگەڕێن. زمـــانە زبـــرەکەی پشـــیلە ئـــامرازێکی نـــاوازەیە بـــۆ خـــاوێنکردنەوەی تووکەکـــانی. گەر بۆنێـــک هـــی خـــۆی نەبێـــت و بە جۆرێـــک لە جۆرەکـــان کەوتبێـــتە ســـەر تووکەکـــانی، دەیســـڕێتەوە و پـــاکی دەکـــاتەوە. تووکە چرچبووکانی هەڵدەکێشێت و لایان دەبات.





هۆکـــاری دی ئەم خۆلێســـانەوەیەیان بـــۆ گەرمبوونەوەیـــانە. وەک دەزانـــن فەروویەکـــی ڕێـــک لە فەروویەکـــی ئاڵۆســـکاو باشـــتر گەرممان دەکاتەوە.

لە کەشـــوهەوای گەرمیشـــدا بـــۆ خـــۆفێنکردنەوە ســـوودی لێـــدەبینن. پشـــیلە لەبەر ئەوەی ئـــارەق ناکـــاتەوە، جەســـتەی بەردەوام گەرم دادێـــت. بەڵام ئەو شـــێیەی بەهـــۆی خۆلێســـانەوەیەوە دەکەوێتە سەر جەستەی، وەک ئارەق جەستەی فێنک دەکاتەوە.




## بۆچی پشیلە بە چەپۆکی پاڵ دەنێت؟

گەر پشــیلەکەتان بە چەپـۆکی پاڵتــان پێــوە دەنێــت، ئەوا پەرۆش مەبـن، ئەمە نیشــانەی ئەوەیە هەســت بە نزیکــی دەکــات لە ئێــوەوە. چــونکە ئەم خــووەی پشــیلە لە ســاوایەتییەوە بۆیــان مــاوەتەوە. کاتێـک بەچـکە پشـیلە شـیری دایکـی دەخـوات، بـۆ ئەوەی شـیری زیـاتر لە گوانەکـانی بێـت، بە چەپۆکیـان پـاڵ بە سـکی دایکیـانەوە دەنێن.

## بۆچی پشیلە لەسەر هەر چوار پەلیان دەکەونە خوارەوە؟

ئەمە سەرســـوڕهێنەرترین تایبەتمەنـــدیی پشــــیلەیە. جەســـتەی پشـیلە ئێجگـار چسـت و چـالاکە. پەرچەکردارەکـانی زۆر خێـران.

لە پاڵ ئەمانەشدا، کلکێکی هەیە بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی بەکاری دەهێنێت. بەم شێوەیە، کاتێک پشیلەیەک لەسەر پشت دەکەوێتە خوارەوە، بە بەکارهێنانی گشت ئەم تایبەتمەندیانە، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا خۆی هەڵدەگەڕێنێتەوە. بەڵام ئەمە بەو واتایە نایەت پشیلە لە هەر بەرزییەکەوە بکەوێتە خوارەوە هیچی لێ نایەت. نەکەن شتی وا تاقی بکەنەوە!

بەڵی هاوڕێیان، ئیدی ئێوە کۆڵێک زانیاری دەربارەی پشیلە دەزانن. ئەوانەی پشیلەیان هەیە، دڵنیام دوای ئەمە باشتر چاودێریی پشیلەکەیان دەکەن. هەروەها ئەوانەشی پشیلەیان نییە، بەڵام لەبەر ئەوەی ماڵەکەیان بۆ ڕاگرتنی پشیلە گونجاوە، بە هەزار تکا و پاڕانەوە دایک و باوکیان ڕازی دەکەن و پشیلەیەک دەکڕن، هیوادارم باش ئاگایان لە پشیلەکەیان بێت...

ئەوانەشی وەک من پشیلەیان نییە، دەتوانن لەگەڵ پشیلەکانی کۆڵانەکەیان باش بن و خۆشەویستییان بۆ ئەم ئاژەڵە شیرینانە دەرببڕن. بەڵام زۆر لێیان نزیک نەبنەوە. هەرچۆنێک بێت لە دەوری ئەو بنەپێ پەمەییی و شیرینانەیان چرنووکێکی تیژیان هەیە. بەڵام میوانداریکردنی پشیلەکان بە چەند پارچە ماسییەکی زیادەی ماڵەوە، زیانی بۆ کەس نابێت، وا نییە؟

# پڵنگ



**پڵنگ پڵنگ هەی پاڵەوان**

**چاونەترس و پیاوی مەیدان**

**لێم دوور مەبە بەقووربان**

دەزانم، هۆنراوەیەکی زۆر ناخۆش بوو. هاوڕێکانم پێم دەڵێن من هەرگیز ناتوانم هۆنراوەیەکی باش بنووسم. وا بزانم دەبێت دەست لە کەللەڕەقی هەڵبگرم و بە قسەیان بکەم. بەڵام زۆرم حەز دەکرد هۆنراوەیەک بۆ پڵنگ بنووسم... چونکە زۆرم خۆش دەوێن. زۆر جوانن، زۆر ڕەسەن و بەهێزن.

ئەگەر کێبەرکێی "کاریزماترین ئاژەڵ" بکرێت، ئەوا بە داوای لێبووردنەوە بۆ شێرەکان، پڵنگەکان براوە دەبن.

پڵنـگ و پشـیلە سـەر بە یەک خێـزانن. بەڵام هێنـدە لە یەکـتری جیـاوازن کە هەرگیـز ناتوانیـت وەک پشـیلەیەک دەسـت بە سـەری پڵنگێکـدا بێنیـت... ڕەنـگە کەمێـک غیـرەت کـۆبکەنەوە و بتـوانن شـتێکی وا بـکەن، بەڵام ئەوە کۆتـا چـالاکی ئەم ژیانەتـان دەبێـت. خـۆ ئەگەر وەک چـۆن یـاری بە کلکـی پشـیلە دەکەیـن، بەو جـۆرە یـــاری بە کلکـــی پڵنـــگ بکەیـــن ئەوا کارمـــان تەواوە. بـــڕوانن زانایەکی هیندی چی دەڵێت:

"نەکەی هەرگیز کلکی پڵنگ بگری!

خۆ ئەگەر گرتت، نەکەی بەری بدەیت!"



لە خێزانـی پشـیلەکاندا تەنهـا پڵنـگ و جـاگوار لە ئـاو ناترسـن و مەلەوانێکـی باشـــن. لەبەر ئەمە گەر پڵنگێـــک بە دواتـــان کەوت لە خـۆڕا خۆتـان هەڵـمەدەنە نێـو ئـاوەوە. لە هیچـی خـۆڕایی نـانی نیوەڕۆی ئەو داماوە دەخوسێنن...



پڵنـگ، کە لە دوای شـێر گەورەتـرین پشـیلەیە، کێشـی دەگـاتە ۲۰۰-۳۰۰ کیلـۆ. باڵاشـیان لە سـمێڵیانەوە تـا سـەری کلکیـان ۳ مەتر دەردەچێت.

پڵنـگ فەروویەکـی پرتەقـاڵی بـۆ قـاوەیی هەیە و هێڵـی ڕەشـی لەسـەرە. هێڵەکـانی هـیچ پڵنگێـک لە هـی پڵنگێکـی دیـکە نـاچن. وەک سـەری پەنـجەی مـرۆڤ، هێڵەکـانی هەر پڵنگێکـیش تـایبەتن بە خـۆی. بەم شـێوەیە دەتـوانین بە هێڵەکانیانـدا پڵنگەکـان لە یەکـتری جیـا بکەیـنەوە. بەڵام بیرۆکەیەکـی ئـاقڵانە نیـیە بە هێڵەکانیانـدا پڵنگەکەتـان لە پڵنگـی دیـکە جیـا بـکەنەوە. لە هەمـووی باشـتر ئەوەیە وریـای پڵنگەکەتـان بـن، ونـی نەکەن! چـونکە هێڵەکـانی سـەر فەرووەکەیـان هاوکاریـان دەبێـت تـا لە نێـو

چـیلکە و چـاڵی دارسـتانەکاندا دیـار نەبـن. زۆر قورسـە لەنێـو دارستاندا بدۆززرێنەوە.

پڵنـگ بە شـەوان ڕاو دەکـات. لە شـەواندا چـاوە درەوشـاوەکانی پڵنـگ شـەش هێنـدەی چـاوی مـرۆڤ باشـتر دەبینن.

بەبێـدەنگی دەجـووڵێنەوە و بۆسـە دەنێـنەوە. کاتێـک هێنـدەی پێویسـت لە نێچیرەکەیـان نزیـک دەبـنەوە، یـاخود کە نێچیرەکەیـان لێیـان نزیـک دەبێـتەوە، ئەو پڵـنگە ٣٠٠ کیلـۆییە وەک ڕمێـک لە شـوێنی خـۆی دەردەچێـت. پڵنـگ دەتوانێـت لە شـوێنی خـۆیەوە پێـنج مەتـر بەرز ببێـتەوە. (قاچەکانتـان بەتەواوی تەواوی بـکەنەوە و پێـنج هەنگـاوی گەورە بـۆ پێشـەوە بنـێن. ئینجـا ئـاوڕ بـدەنەوە و تەماشـای خـاڵی سـەرەتاتان بـکەن. پڵنـگ دەتوانێـت ئەوەنـدە بەرز ببێتەوە.)

پڵنگێـک دەتوانێـت چەنـد ڕۆژێـک بە خـواردنی تەنهـا ئاسـکێک بەڕێ بکات. ئاژەڵێکی چاوبرسی و نەوسن نییە.

ئەی پـێم وتـن پڵنـگ مەلە دەزانێـت؟ بەڵـێ، مەلەوانێکـی زۆر باشـن. خۆیـان هەڵـدەدەنە ڕووبارەکـانەوە و هەنـدێک جـار تەنانەت ماسیش ڕاو دەکەن.

بێگومان هەندێک جار ماسیگریش ڕاو دەکەن!

هەنـدێک جـار پڵنـگ و تیمسـاح لەنـاو ئـاودا دەبێـتە شـەڕیان. زۆر کات لەم شەڕەدا پڵنگەکە براوە دەبێت.

هـیچ پڵنگێـک -گەر ناچـار نەبێـت- پەلامـاری مـرۆڤ نـادات. لە هەر ١٠٠٠ پڵنگێـــک تەنیـــا یەک دووانێکیـــان پەلامـــاری مرۆڤیـــان داوە. لە زۆربەی جارەکانیشـــدا تـــاوانی پڵـــنگەکەی تیـــا نەبـــووە. هۆکـــاری ئەم شـــەڕانە بەگشـــتی دەگەڕێـــتەوە بـــۆ ئەوەی مرۆڤەکـــان نـــازانن لە کـــوێ لابـــدەن. چـــونکە پڵنـــگ بـــۆ پاراســـتنی ناوچەکانیـــان زۆر هەســـتیارن و نایەنەوێـــت هـــیچ کەســـێک نزیکـــی ناوچەکەیان بێتەوە.








کاتێــک بەچــکە پڵنگەکــان لەدایــک دەبــن، چاویــان نابینێــت. دوای دوو ڕۆژ دەســـــت بە بینـــــین دەکەن. لەگەڵ چاویـــــان دەکــرێتەوە، یەکەم شــت کە دەیبیــنن پڵنگێکــی دڕنــدەیە! بەڵام ئەم پڵــنگە دڕنــدەیە دایکیــانە و وەک گشــت دایکەکــانی دیــکە بەرامــبەر بەچکەکــانی میهرەبــانە. بــۆ مــاوەی شــەش هەفــتەی تەواو شــیریان پێدەدات و دواتر فێری ڕاوکردنیان دەکات.

پڵنگەکــان لەو ئــاژەڵانەن کە خەریـــکە ڕەچەڵەکیــان لەنـــاو دەچێــت. بەڵـــێ زۆر بەهێــزن، ڕاوکەرێکـــی زۆر شـــارەزان، بەڵام وەک زۆر شــتی جــوانی دیــکە لە دەســتی چاوبرســێتی مرۆڤەکــان خۆیان بۆ ڕزگار نەکراوە.

پڵنگەکـــان ســـاڵانێک بێبەزەییـــانە بـــۆ بەدەســـتهێنانی فەرووە نایابەکەیـــان یـــاخود بـــۆ دروســـتکردنی دەرمـــان لە ئەنـــدامەکانی جەســـتەیان دەکـــوژران. ئێســـتا لەســـەر ڕووی زەوی ٣٠٠٠ پڵنگـــی لێیە یان لێی نییە. لەبەر ئەوە باش ئاگاداری پڵنگەکەتان بن!

چی؟! پڵنگتان نییە؟!

ئەی بـــۆ لە ســـەرەتاوە قســـەتان نەکـــرد! باســـی تـــووتیمان دەکرد...



# دەفتەری یادەوەرییەکانی هەنگ



١- گەر ئێستا من ببینن، هەرگیز نالێن: "ئەمە هەنگە!" لەناو یەکێک لە شانەکانی شارەکەمدام. کەمێک پێش ئێستا لەلایەن شاژنەوە لێرە دانرام. بالام هێشتا ٢ ملیمەتر نابێت. ڕەنگم سپییە و لە دەنکە برنج دەچم. واتە من گەرایەکی هەنگم.

٢- ئەم چەند ڕۆژەی ڕابردوو زۆر سەرمان قالْ بوو. ئیدی گەرایەکی بێچووڵە نیم. بەڵام هێشتا هەنگیش نیم. لە کرمۆکەیەکی وردیلە دەچم و ناچم. توێکڵی گەراکەم دڕی و هاتمە دەرەوە. وااااییی! ئەم ژووورە شەشپاڵووە چەند گەورەیە! من ئێستا مێتۆلکەم.

٣- لە ڕۆژێکدا ١٣٠٠ جار خواردنم بۆ دێنن. نازانم کێیە خواردنم بۆ دێنێت، بەڵام وا دیارە خوشکە گەورەکانم بن.



خواردنەکـان هێنـدە شـیرینن کە
هەر جارێـک دەیهێـنن، خێـرا
دەیخـــۆم و بە تـــامەزرۆییەوە
چـاوەڕێی ژەمـی دواتـر دەکەم.
چـــونکە بـــۆ ئەوەی بـــبمە
هەنگێکـــی بـــاش، دەبێـــت
خـــواردنی بـــاش بخـــۆم.
ئێستاش وا بوومەتە کرمۆکە.

٤- لە چـاو دوێنێـدا پێـنج هێنـدە زیـادم کـردووە. لە قسـەکانی خوشـکەکانمەوە تێگەیشـتم ١٥٠٠ سـاوای دیـکەی وەک منـی لێیە.

ئەمـڕۆش ١٣٠٠ مەمـکە شـیریان پـێ دام. ئێسـتا هەسـت بە بەهێزی دەکەم.

٥- جەســتەم وردە وردە دەگۆڕێـــت! زۆر بەپەرۆشـــم. خـــودایە گیان، تـۆ بڵێیـت منـیش بـاڵم لێبڕوێـت؟ تـۆ بڵێیـت ئەم گـوڵ و ئەو گوڵ بفڕم؟

٦- دوێنـێ شـەو کەمێـک سـارد بـوو. بەڵام گشـت هەنگەکـانی شـــارەکە لە دەوری ژووری بەچکەکـــان کۆبـــوونەوە. ئیـــتر گەرم بـــووینەوە و ســـەرمامان نەبـــوو. وەک بیســـتوومە، دەبێـــت پـــلەی گەرمیـــی ژوورەوە ٣٠ بـــۆ ٣٥ پـــلە بێـــت. ئەگەر کەمێـــک ســـاردتر



بێــت، نەخــۆش دەکەویــن. لەبەر ئەوە دادەکانمــان بەردەوام چــاودێریی پــلەی گەرمیی ژوورەکان دەکەن.

٧- ئیــتر لەبــاتی مەمەی شــیر خــواردنی هەنگــمان پــێ دەدەن. کە خۆشــە گەورە دەبم!

٨- وا هەفـــتەیەک دەبێـــت لەم شـــانەیە دانـراوم. هێنـدە بـاش چاودێرییـان کـردووم کە ٥٠٠ هێنـــدە زیـــادم کـــردووە! بەڵام هێشتا بۆ چوونە دەرەوەم زووە.

٩- لەوەدا بــووم دەمــوت: "منیــان بیرچــووە!" کە پێیــان ڕاگەیانــدم ئیــتر خــواردن تەواو. چەنــد هەنگێکــی شــارەزا هــاتن و دەرگــای ژوورەکەیــان بە مــۆم لــێ داخســتم. خــودایە گیــان، ئەوە چــی ڕوو دەدات؟ زۆر دەترسم!

١٠- ترســەکەم ڕەویــیەوە. وا بــزانم بــۆ ئەوەی بــبمە هەنگێکــی تەواو، دەبێــت بەم قۆنــاغەدا تێــپەڕم. لە دەمــمەوە ڕیشــاڵێکی وەک ئاوریشــم دێــتە دەرەوە. لە خەونمــدا بینیــومە چــی لەم ڕیشــاڵە بــکەم. جــوان جــوان بە دەوری خۆمــدا قــۆزاخەیەکم چنــی. ئێســتا بــۆ خــۆم لە نــاو قۆزاخەکەمــدا دەخەوم. ئیــتر بــوومە کرمــۆکەی نــاو قۆزاخە.

١١- چاوەڕێ دەکەم. جگە لە چاوەڕوانی هیچ کارێکی دیکەم نییە. بزانم خودا چ سوپرایزێکی بۆ ئامادە کردووم.

١٢- لەناو قۆزاخەکەدا پێستم گۆڕا. ڕاستییەکەی زۆر باشبوو وام لێهات، چونکە جلە کۆنەکانم بەتەواوی تەسک بووبوونەوە. جلە تازەکانم زۆر کەشخەن!

١٣- ئیدی وا چاوەکانم بە دیار دەکەون! زۆر دڵم خۆشە. خودایە گیان، تۆم زۆر خۆش دەوێت. خودایە گیان، بینینی گوڵەکان بکەیتە نسیبی منیش.

١٤- جەستەم وا دەگۆڕێت. هەست دەکەم لە ماوەیەکی کەمدا دەبمە هەنگێکی تەواو.

١٥- وا هەفتەیەک دەبێت لەناو قۆزاخەکەمدام. جەستەم بەتەواوی لە هەنگ دەچێت. تەنانەت شاخە هەستەوەرەکانیشم دەرکەوتوون. ئینجا ڕەنگیشم سپی نەماوە.

١٦- ئەم بەیانییە کە چاوم کردەوە، چی ببینم؟! چاوم، شاخە هەستەوەرەکانم، سکم، باڵم، قاچم و تەنانەت چزووشم هەیە! وا بزانم بەم نزیکانە لێرە دەردەچم.

١٧- فەرمانی چاوەڕوانکراو گەیشت. دەرگای ژوورەکەم دڕی و هاتمە دەرەوە. سەرەتا تەماشای دەوروبەری خۆم کرد. هەزاران خوشک و برام هەیە. هەموویان وەک من هەوڵیان دەدا لە قۆزاخەکەیان بێنە دەرەوە.

هەر کە هـاتمە دەرەوە، دەسـتێکم بە سـەر و چاومـدا هێنـا و خۆم ڕێکخست و قژم جوان داهێنا.

١٨- هێشـتا قەدەغەیە بچـمە دەرەوەی شـارەکە. دەبێـت لەنـاو شارەکەدا بمێنمەوە، خەریکی خاوێنکردنەوە بم.

١٩- ئەمـڕۆ پـلەکەم بەرزکـرایەوە. کارەکـانی پێشـووم دایە دەسـت کۆمەڵێـک هەنگـی گەنـج و ئێسـتا کـاری مـن بردنـی خـواردنە بـۆ کرمۆکەکـان. بەشـێک لەو خـواردنەی پـێمان دەدرێـت دەیکەیـن بە شیر و لە دەم دەرگای ژوورەکەیاندا بۆیان دادەنێین.

٢٠- کارەکەمـان زۆر قورسـە! ڕۆژی ١٣٠٠ جـار خواردنیـان پـێ دەدەین، بەڵام کارەکەمم زۆر خۆش دەوێت.

٢١- دووبـارە پـلەکەم بەرز کـرایەوە. ئیـدی پـێمان ڕاسـپێردراوە ئەو هەڵاڵانەی لە گوڵاکـانەوە دەیهێنـنەوە، لێیبنێـین و بـیکەین بە هەنگوین. بۆنێکی هێندە خۆشیان لێدێت!



٢٢- ئەمـرۆ خوشـک و براکـانم کێڵگەیەکـی لێوانلێـو لە گوڵیـان دۆزیوەتەوە. هەموومان زۆر خۆشحاڵین.

٢٣- ئەمـرۆ خـودا فێـری کـردم لە مـۆم شـانە دروسـت بـکەم. هەمـوو ڕێکارەکـانم لە خەونمـدا بینـی. شـانەکان لە شـێوەی شەشـپاڵوودا دروسـت دەکەیـن. بەم جـۆرە لە نـاوچەیەکی بچووکـدا بـوارێکی فـراوان بەدەسـت دەهێنـین. جـگە لەوەش، هیچ بۆشاییەک لە نێوان شانەکاندا نامێنێتەوە.

٢٤- ئەمرۆ بەنـاوی فڕێـدانی خۆڵەکـانی شـلەکەوە بـۆ یەکەم جـار دەرەوەم بینـی. خـودایە! ئەم دنیـایەت چەنـدە جـوانە! ئاسـمانی شـین، خـۆری درەوشـاوە، گـوڵە ڕەنگاوڕەنگەکـان... بەڵام زۆر دوور نەکەوتمەوە.

٢٥- ئەمـرۆ نـاوم بـۆ سـەربازی هـاتەوە. ئیـدی دەبێـت لە نـاو دەرگـای شـلەکەدا ئێشـک بگـرم. چـزووەکەم هێـدە تیژبـووە، مەپرسە!



٢٦- مـــاوەی ســـەربازییەکەم تەواو بـــوو. زۆر خۆشـــحاڵم، لە کۆتاییدا بۆ هەڵاڵە کۆکردنەوە دەنێردرێم.

٢٧- ئەمڕۆ لە دەوری شـلـ ەکە پـرۆڤەی فـڕینم کـرد. دەشـبێت بـاش شارەزای دەوروبەرەکم ببم.

٢٨- لەولای شــلـ ەکەمانەوە گردۆڵکەیەکــی لێــیە پڕیەتــی لە گــوڵ. چــووم بــۆ ئەویَ. هەمـــوو جێــیەک ڕەنگاوڕەنــگ بــوو. بــۆنی میســـکیان لێـــدەهات. دەتـــوانم زۆر بەخێرایـــی بفـــڕم. لە هەر چرکەیەکدا ٢٥٠ جار باڵەکانم ڕادەوەشێنم.

٢٩- ئەمـــڕۆ هەر ئەم گـــوڵ و ئەو گـــوڵم کـــرد. تـــۆزی گـــوڵ بە هەمـــوو گیـــانمەوەیە. هێنـــدەم هەڵاڵە هەڵقوڕانـــدووە، خەریـــکە بـتەقم. گەڕامەوە بـــۆ شــلـ ەکە و هەمـــوویم بەتـــاڵ کـــردەوە. ئینجـــا جارێکی دیکە ڕۆیشتمەوە...



٣٠- ئیـــــدی کەشـــــوهەوا زۆر گەرم بـــــووە. تەواوی ڕۆژەکەم بە گەڕان بە نێــو گوڵەکـــان و کـــۆکردنەوەی هەڵاڵەوە بـــردە ســـەر. دواتـــریش دەمـــبردنەوە بـــۆ شـــاڕەکە. بەم جـــۆرە کەرەســـتەی پێویســـتمان بـــۆ دروســـتکردنی هەنگـــوین دەســـت دەکەوێـــت. لەم نێوەنـــدەدا پێویســـتیمان بە ئـــاویش دەبێـــت. لەبەر ئەوە هەنـــدێک لە هاوڕێیان ڕاسپێدراون ئاو بۆ شاڕەکە بگوازنەوە.

٣١- ســـەردەمانێک لە نـــاو شـــانەیەکدا گەرایەک بـــووم، ئێســـتاش هەنگێکـــی چســـت و چـــالاکم و لەم گـــوڵ بـــۆ ئەو گـــوڵ دەفـــڕم. تەمەنم شەش هەفتەیە. ئەمە بۆ ئێمە تەمەنێکی دووورودرێژە.

٣٢- گەر ژیـــانێکی وەک مـــن چالاکـــت هەبێـــت، ئەوا لە مـــاوەی شـــەش هەفـــتەدا دەتوانیـــت ٣ جـــار بە دەوری زەویـــدا بســـووڕێیتەوە. ئیـــتر مانـــدوو بـــووم. بەڵام خۆشـــحاڵم کە یەک خـــولەکی تەمەنـــم بەخۆڕایی تێنەپەڕیوە.

٣٣- منـــداڵەکان، مـــن ئیـــتر پیربـــووم. بە درێژایـــی تەمەنـــم هەر لە خـــۆمم دەپرســـی: "ئەم هەمـــووە هەنگوینەمـــان بـــۆچییە؟" چـــونکە زۆر لە پێویســـتیی خۆمـــان زیاترمـــان هەنگـــوین هەڵچنیـــوە. ئەمـــڕۆ وەڵامـــــی پرســـــیارەکەم زانـــــی. خـــــاوەنی شـــــانەکە هـــــات و هەنگوینەکەمـــانی هەڵگـــرت. تێگەیشـــتم مرۆڤەکـــان پێویســـتیان بە هەنگـــوینە. ئـــێمەش بێئاگـــایی خۆمـــان لەبەر ئەوان کـــار دەکەیـــن و هەنگوین دروست دەکەین.

حەزتـــان لە هەنگـــوینە؟ مەڵـــێن "نـــا!" زویـــر دەبـــم. مـــن بە درێژایـی تەمەنـم بـۆ ئەوە کـارم کـردووە تـا ئێـوە هەنگـوین بخـۆن. هـیچ پەشـیمانیش نـیم، هێنـدەم بەسـە کاتێـک ئەو هەنگـوینە ئـاڵ و بۆن خۆشەت کرد بەسـەر نـانەکەتەوە، بـۆ سـاتێک منـت بیـر بێـتەوە و ڕووو بکەیــتە ئەو پەروەرێــنەی هەزاران هەنگــی وەک منــی لەبەر تــۆ خســتووەتە گەڕ و بڵێیــت: "خــودایە گیـــان، زۆرم خـــۆش دەوێــت، چــونکە لەبەر مــن هەنگەکانــت ڕاســپاردووە هەنگــوین دروست بکەن!"

خــوات لەگەڵ دنیـــا! خواتـــان لەگەڵ گـــردۆڵکە گوڵـــدارەکان! خواتان لەگەڵ منداڵە چاوگەشە تامەزرۆکانی هەنگوین!

ڤزززز... ڤززززز... ڤززز



# ئەوە دەڵێن "زەدەواڵە هیچ سوودێکی نییە"؟



ئەگەر وا دەزانن لەبەر ئەوەی هەنگوین دروست ناکەن هیچ سوودێکیان نییە، بەهەڵەدا چوون! ئەگەر وا بیر دەکەنەوە زەردەواڵە گەورە و خرپنەکان، بە تووکە ڕەش و زەرد و سوورەکەیانەوە بە درێژایی ڕۆژ لەنێو گەڵای گوڵەکاندا خۆیان دەخافڵێنن و ڤزەڤزیانە تا منداڵ بترسێنن، ئەوا پێدەچێت کەمێک ڕاست بکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر شت هەیە دەربارەیان نایزانن.

وەرن دەرفەتێک بە زەردەواڵە بدەن و تا کۆتایی ئەم نووسینە بخوێننەوە.

چونکە لەبەر خاتری ئێوە دیمانەیەکم لەگەڵ زەردەواڵەیەکدا ساز کرد. تکایە با نەچینە سەر هەندێک وردەکاری وەک چۆن یەکمان ناسی و چۆن کات و شوێنی دیدارەکەمان دەستنیشان

کـرد. بەڵام گەر زۆر بەپەرۆشــن بـزانن، ئەوا بـا پێتـان بڵـێم: پێـوەی نەدام.

**- سڵاو زەردەواڵەی بەڕێز!**

- سڵاو دۆستی من!

**- بۆچی بە منداڵانەوە دەدەن؟**

- دەی ئـێمە حەزمـان لە شـتی شـیرینە. بۆخۆشــت دەزانیـت منـداڵ زۆر شیرینە!

**- بەڕاستە؟**

-گـاڵتەم کـرد. بـڕوانە، ئـێمەی زەر دەواڵە لە خۆمـانەوە بە کەسـەوە نـادەین. ئامۆژگـاریم بـۆ منـداڵەکان ئەوەیە گەر شـوێنێک شـاری زەردەواڵەی لێبـوو، وشـیار بـن. بـا لە شـارەکە نزیـک نەبـنەوە. چـیلکە و چاڵیشـی تـێ نەسـوون، -ئەمەیـان دەرئەنجـامەکەی خراپترە.

**- بەگـوێرەی قسەوباسـەکان بێـت ئێـوە جیـا لە هەنگەکـان دەتـوانن چەند جارێک بە کەسێکەوە بدەن، ڕاستە؟**

- شەرمیشە، لە ڕاستیا بەڵێ، تایبەتمەندییەکی وامان هەیە!

**- باشە، لە زەردەواڵەبوونت شەرمەزار نیت؟**



- هەرگیــز! بەڵــێ هەنگەکــان لەبەر ئەوەی هەنگــوین دروســت دەکەن، هەمــوو ناوبانگەکەیــان بــۆ خۆیــان بــردووە. مرۆڤەکــان بەزۆری ئەوانیــان خــۆش دەوێــت، بەڵام ئــێمەش ســوودمان بــۆ مرۆڤەکــان زۆرە. جــگە لەوەش، ئــێمەش هەنگــوین دروســت دەکەیــن و هەنگــوینەکەی ئــێمە لە هــی هەرچــی هەنــگە خۆشتریشــە، بەڵام بەس بەشــی خۆمــان دروســت دەکەیــن، هاهاها!

- دەڵێن: زەردەواڵەکان بەردەوام لەگەڵ یەکتر شەڕیانە، وایە؟

- تەنیا لە وەرزی بەهاردا دەبینیت زەردەواڵەکان شەڕیان بێت. واتە ئەو کاتەی شاژنێکی لاو هەوڵ دەدات پلەوپایە و خۆراکی شاژنە کۆنەکە داگیر بکات.

**- با بێینە سەر کۆتا و گرنگترین پرسیار! هەنگوین بەشی مرۆڤەکان دروست ناکەن، باشە، پێم بڵێ چ سوودێکتان هەیە؟**

- هەرگیز شووتی و کاڵەک و کولەکەت خواردووە؟

- بێگومان!

- وەڵامی پرسیارەکەت هەر ئەوەیە. زەردەواڵە کە ئەم گوڵ و ئەو گوڵ دەکات، تۆوی گوڵەکان لەگەڵ خۆی دەگوازێتەوە. بە تۆوی گوڵێک گوڵێکی دی دەپیتێت و میوە و سەوزەی لێ پێدەگات. هەزاران جۆری گوڵ بە هۆی ئێمەی زەردەواڵەوە دەپیتێنرێن. هەنگیش هەمان کار دەکەن، بەڵام ئەوان وەک ئێمە ناتوانن لە هەموو جێیەک بژین.



- باشە، لە کۆتاییدا هیچ شتێکت بۆ هاوڕێیان هەیە بیڵێیت؟

- ناحەقتـــان نیـــیە لە ئـــێمە بترســـن. بەڵام تکـــایە زۆر گەورەی مەکەن! هەر هێنـــدەی لە لانەکانمـــان دووربـــن، هـــیچ زیانێکتـــان پێنـــاگەیەنین. هەرگیـــز وا مەزانـــن مێروویەکـــی بێکەڵکـــی تـــۆقێنەرین. ڕەنـــگە هەر ئەو میـــوەیەی ئێســـتا دەیخـــۆن، لەلایەن زەردەواڵەیەکەوە پیتێنرابێـــت! هەرگیـــز ئەمەتـــان بیـــر نەچێـــت. هیـــنە، بیرشتان بێت دەتوانین لە جارێک زیاتر پێوە بدەین...

هاهاها! هینە وابزانم دەبوو بڵێم: "ڤزز ڤزز ڤزز!"



# مێشێك لە ژوورەكەمدایە



لە ژوورەكەمدا دانیشتبووم و كتێبەكانم تێكوەردەدا. لەناكاو **"ماسكا دۆمێستیكا"**یەكی خڕپن هات و بەسەر سەرمەوە كەوتە خولانەوە.

بەهەڵە نەتانبیست، وتم "ماسكا دۆمێستیكا".

"ماسكا دۆمێستیكا" ناناسن؟

چۆن؟

كەس هەیە مێش نەناسێت؟ ئۆف، لە دەمم دەرچوو. بە نیازبووم تا كۆتایی بەشەكە هەر باسی "ماسكا دۆمێستیكا"تان بۆ بكەم و پێتان نەڵێم ئەم مێشەی خۆمانە و شێتتان بكەم.

مادەم نهێنییەكەم ئاشكرا بوو، وەرن با بتانبەم بۆ گەشتێكی ناوازە لە جیهانی مێشەكاندا. دەی بەڕێ دەكەوین. **ڤززززز... ڤزززززز!...**

***

لە میسـرى كۆنـدا، پشـیلە پیـرۆز بـووە، مانگایـان پەرسـتووە و قـالۆنچەی پەیینیـان بە بەختهێـنەر زانیـوە. ئەی مـێش؟ گوێتـان شـل بكەن:

مێشیان بە هێمای چاونەترسی و بوێریی داناوە!

دەتـوانن مـێش بە دەسـت ڕاوەشـاندنێک دەربـكەن. بەڵام لەوسـەرەوە خولێـک دەخـوات و دەگەڕێـتەوە سـەر لووتتـان. لەمـلاوە دەریـبكەن، لەولاوە دێـتەوە. مـێش لە هەر شـوێنێک نیشـتەوە (ئەگەر قـاپە شـۆربایەكیش بێـت) بە مـاڵی خۆیـانی دەزانێـت. هەر ئەوەنـدەی ناڵێـت: "ئـێمە قەرەبـاڵغترین، ئێـوە بـڕۆن" سوپاسی خودای دەوێت.

## مێشێک لەدایک دەبێت

مـێش ملیۆنـان گەرا دادەنـێن. لە زەلكاوەكانـدا، لە سـەتڵە خـۆڵە بۆگەنكردووەكانـدا و لە هەر شـوێنێكی دی كە حەز نەكەن بە لایدا بڕۆن...

هێنـدەت زانـی گەراكـان دەتەقـن و كرمـۆكەی ورد بەو نـاوەدا بـڵاو دەبـنەوە. هەر كە لە گەراكانیـان هـاتنە دەرەوە، دەكەونە خـواردنی خـواردنە(!) زۆر و زەبەنەكەی دەوروبەریـان. پـاش

مــاوەیەک کرمــۆکەکە تــوێکڵێکی هاوشــێوەی قــۆزاخە بە دەوری خۆیــدا دەچنێــت. لەنــاو قــۆزاخەکەدا گەورە دەبێــت. هەر کە بەتەواوی گەورە بــوو،دێــتە دەرەوە و ڕاســتەوخۆ بەرەو مــاڵی ئێــوە ڕادەکات.

## ئامێرێکی فڕینی ناوازە

پســپۆڕێکی شــارەزای مــێش دەڵێــت: "مرۆڤــایەتی ناتوانێــت لە مــاوەی دوو ســەد ســاڵی داهــاتوودا هەلیکــۆپتەرێکی هاوشــێوەی مێش دروست بکات." بەڵێ، مێش موعجیزەیەکی فڕینە.

هەر مێشێک بەر لەوەی بفڕێت، ئەم کارانە دەکات:

لە ڕێــی ئەنــدامی ڕێــدۆزییانەوە،ئاڕاســتەی خۆیــان دەستنیشــان دەکەن.

ئەنــدامی هاوســەنگییان ڕێــک دەخەن و دەچــنە ســەر بــاری فڕین.

لەڕێــی شــاخە هەســتەوەرەکانیانەوە ئاڕاســتە و تینــی بــا دیــاری دەکەن و تەواوی ئەم کــــارانەش لە یەک بەش لە ســــەد بەشــــی چرکەیەکــدا ئەنجــام دەدەن و دەفــڕن. مێشــکی مــێش، کە هێنــدەی ســـەرەدەرزییەک دەبێــت، زۆر بەخێرایـــی ئەم هاوکێشـــانە ئەنجـــام

دەدات و تەنانەت بەهێزترین کۆمپیوتەریش شان لە شانی نادات.

کاتێک مێش دەفڕێت لە چرکەیەکدا ٢٠٠ جار باڵەکانی ڕادەوەشێنێت. گەر ئێمە لە چرکەیەکدا ٢٠٠ جار باڵمان ڕابوەشێنین ئەوا هەر لە چرکەی سەرەتادا قۆڵمان لە شوێنی خۆی دەردەچێت و لێدەبێتەوە. بەڵام مێش دەتوانێت ئەو باڵە تەنکەیان لە چرکەیەکدا ٢٠٠ جار ڕابوەشێنن و دەشتوانن بەم شێوەیە بۆ ماوەی ٣٠ خولەک (٣٠ * ٦٠ = ١٨٠٠ چرکە) بێ وەستان بفڕن.



## زمانی مێش لە کوێیدایە؟

لەژێـــر پێیەکانیـــدایە! بەڵـــێ، بەهەڵە نەتانبیســـت. مـــێش بە پێیەکـانی تـامی شـت دەکـات. وا دەزانـن بـۆچی بەپێـداگرییەوە بەسەر میوەدا دێن و دەچن؟ بۆ ئەوەی تامیان بکەن!

## هێزی کێشکردنی زەوی و ئەم شتانە چین؟

تایبەتمەنـدییەکی دی مـێش، کە ئـێمەی مرۆڤەکـان لە ئیرەییـدا خەریـکە شـێت بـکەن، ئەوەیە دەتـوانن بە سـەقفا بـڕۆن. دەڵێیـت هێـزی کێشـکردنی زەوی کـار لەوان ناکـات. نهێنیـی کـارەکە لە پێیەکانیانـدایە. بینیوتـانە تەوالێـت بە چـی بەردەدەن؟ قـاچی مێشـەکانیش وەک ئەوە وایە و بەر هەر شـتێک کەوت، پێـوەی دەنووسێت.

## جوانترین شتی تۆ، ئەو چاوە سەرسوڕهێنەرانەتن!

چـاوی مـێش بەتەواوی واتـا مـوعجیزەیە. هەر چـاوێکی لە ٣٠٠٠ چـاوی ورد پێکـدێت. واتە تێکـڕا ٦٠٠٠ چاویـان هەیە و دەتوانن هەر چوارلایان ببینن.



مـروّڤ له هەر چركەیەكـدا ٦٠ دیـمەن دەبینێـت، بەڵام مـێش ٢٠٠ دیـمەن دەبینێـت. ئەمە واتـا؛ كاتێـك ئێـوە هەوڵ دەدەن بە هەمـوو هێزتـانەوە مێشـكوژەكە بە سـەری مێشـەكەدا بكێشـن، ئەو هەر لە سـەرەتاوە دركـی بە جووڵەكەتـان كـردووە و لەولاوە تەماشاتان دەكات.

***

ئەو مێشـەی كەمێـك لەمەوبەر لێـرە دەخـوولایەوە، دیـار نەمـا. دەتـوانم سـوێند بخـۆم، ئێسـتا بەسـەر كـێكەكەی چێشـتخانەوەیە. دەبێـت بـڕۆم بـۆ گیـانی. بەڵام بەر لەوەی بـڕۆم، ئامۆژگـارییەكی بچووكم بۆتان هەیە:

بە درێژایی وەرزی هاوین ڕووبەڕووی زۆر مێش دەبنەوە. هەندێکیشیان بێزارتان دەکەن و حەز دەکەن چی زووترە لە دەستیان دەربازتان بێت. دەتوانن بە مێشکوژێک یان بە سەرینێک بە مەبەستتان بگەن. بەڵام سەرەتا بیرێک بکەنەوە ئەو زیندەوەرە وردە بێزارکەرەی بە سەرتانەوە دەخولێتەوە، چەندە ناوازەیە! ماوەیەک تەماشایان بکەن، تەنیا تەماشایان بکەن...






# لوولپێچ و کرمەلیقە



سەرەڕای ئەوەی زۆر خاڵی هاوبەشیان لە نێوانیاندایە، نابێت لەگەڵ یەک تێکەڵیان بکەین. باسی لوولپێچەکان دەکەم! لوولپێچ و کرمەلیقە. یان دەبێت بڵێم: "کرمەلیقە و لوولپێچ"؟ نا، نا! "لوولپێچ و کرمەلیقە!" ئەویش نابێت! وا بزانم منیش تێکەڵم کردوون.

لە ڕاستیدا زۆر کەس وا دەزانن لوولپێچ و کرمەلیقە یەک جۆر ئاژەڵن. چونکە، هەمان شت دەخۆن، لە هەمان شوێندا دەژین، ڕەنگیان زۆر لە یەک دەچێت. بەڵام کرمەلیقەکان وەک لوولپێچەکان قاوغێکیان نییە، تا لەو کاتانەی دەترسن یان دڵتەنگ دەبن یان باران دەبارێت، خۆیان تێ بخزێنن.

لوولپێچەکان وەک کیسەڵ ماڵیان بە کۆڵی خۆیانەوەیە. بێگومان قاوغەکەی ئەوان هێندەی هی کیسەڵ پتەو نییە. بەڵام بۆ لوولپێچێک ناوازەیە. کەواتە ئێستا کرمەلیقە لوولپێچێکی بێ

ماڵ و حاڵە؟ دەکرێت بڵێین نەخێر، چونکە پێویستییان بە ماڵ نییە. ماڵیان نییە، بەڵام پاڵتۆیەکی زۆر ئەستووریان لەبەردایە.

ئێستا پرسیارێک بۆ ئێوە:

"گەر لوولپێچێک قاوغەکەی لێبکەیتەوە، دەبێت بە کرمەلیقە؟"

وەڵام: "نەخێر، هەر لوولپێچێک قاوغەکەی لێبکرێتەوە، ئیدی دەمرێت!"

قاوغی لوولپێچەکان لوولپێچە. پاڵتۆی کرمەلیقەکانیش پێستێکی ڕەقە.

لوولپێچ و کرمەلیقە بە خۆخشاندن بەرێدا دەڕۆن. وا بزانم پێویست ناکات بڵێم زۆر خێرا نین. وەک تایەی دەبابە بە شەپۆل شەپۆل دەڕۆن.

لوولپێچەکان و کرمەلیقەکان یەکی چوار شاخی هەستەوەریان هەیە، دووانی کورت و دووانی درێژ.

گەر پێتان بڵێم ئەمانە هەرچی کەناڵی ڕادیۆیە لە کورت و درێژ هەمووی وەردەگرن، باوەڕ دەکەن؟

باوەڕ ناکەن؟ گومانم بردبوو. ڕاستییەکەی، هەستەوەرە درێژەکان چاون و هەستەوەرە کورتەکانیش لووتن. بەڵێ، ئەمەیان باوەڕپێنەکراوترە، وا نییە؟ بەڵام ڕاستییە!

لـوولپێچ و کـرمەلیقە بە زمـانە بـڕبەن ئاسـاکەیان شـت دەخـۆن. بەگشـتی ڕووەک دەخـۆن، بـۆ نمـوونە، زۆر شـەیدای شـلیکن. بەڵام ڕووەکخـۆر (ڤێجیتەریـان) نـین. گۆشـتی ئـاژەڵی مـردوو یـان زینـدووش دەخـۆن. گەر زۆریشـیان برسـی بێـت، یەکـتریش دەخۆن!




ئەم زینـدەوەرانە بە بـێ چڵـم هـیچ شـتێک نـاکەن و نـاتوانن بجووڵێن.

چڵمەکەیـان دەردراوێکـی لـیقن و لکێـنەرە. بەگـوێرەی ئەو شـوێنەی پێیـدا تێـدەپەڕێت، پێکهـاتەکەی دەگۆڕێـت. بـۆ نمـوونە، گەر بە شـوێنێکی خـزدا بـڕۆن، لکێـنەر دەبێـت، گەر بە شـوێنێکی

ڕەق و زبـردا بـڕۆن، لـیقن دەبێـت. بەم جـۆرە قـاچە نەرمۆڵەکـانی لـوولپێچ و کرمەلیقەکـان لە کـاتی ڕۆیشـتندا زیانیـان بەرناکەوێـت. ئەو چڵـمە هێنـدە بەهێـزە کە لـوولپێچ دەتوانێـت بەسـەر ڕووە تیژەکەی گوێزانێکدا بڕوات و هیچی لێنەیەت.

هەندێک جـار لـوولپێچ یـان کـرمەلیقە ڕێیـان لە لینجـی یەکێکـی دیـکە هەڵـدەکەوێت و بـێ ئەوەی لینجـی زۆر دەربـدەن، دەتـوانن بە شـوێن پێـی هاوڕێکەیانـدا بـڕۆن. بەم شـێوەیە دەسـت بە لینجییەکەیانەوە دەگرن. چۆنە، ژیرانە نییە؟

## سوودەکانی چڵم بە سڕینی کۆتایی نایەت!

چڵـم پارێزگـاری لە شـێداریی جەسـتەیان دەکـات. لە کەشـوهەوای سـارد و وشـکدا ئەو چڵـمە بـۆ پاراسـتنی تەندروستیی کرمەلیقەکە زۆر پێویستە.

یەکێـک لە گـرنگترین ئەرکەکانیشـی پاراسـتنی لـوولپێچەکەیە. بەڵـێ، هەر کاتێـک لـوولپێچ هەسـتی بە مەترسـی کـرد، چڵمـی زۆر دەردەدات. ئەمەش بەسـە بـۆ ئەوەی دوژمـنەکەی ئیشـتیهای نەمێنێـت. بـۆ نمـوونە، گەر چـۆلەکەیەک بیەوێـت یەکێکیـان بخـوات، هەر کە ئەوەی بینـی، دەڵێـت: "ئـۆوف، دڵـم بە یەکـدا هات!" و پاشگەز دەبێتەوە.

کاتێک لوولپێچەکان دەچنەوە نێو قاوغەکانیان، دەرگای ماڵەکەیان بە چڵم دەگرن.

وا بزانم کەمێک زانیاریتان دەربارەی لوولپێچ و کرمەلیقەکان دەست کەوت. لە کۆتاییدا ئەم ئاگادارییەتان پێ دەڵێم:

کاتێک لە شەوە فێنکەکانی هاویندا بە نێو پارکێکدا پیاسە دەکەن، وریای بەر پێتان بن. بەتایبەتی گەر باریکە ڕێیەکی درەوشاوەتان بینی، ئەوا دڵنیابن لەوەی لوولپێچێک یان کرمەلیقەیەک لەو نزیکانەیە. ئەمە جگە لەوەی، هێندەش خێرا نین بتوانن خۆیان لەژێر پێی ئەم و ئەودا دەرباز بکەن. دواتر نەڵێن: "ئەو چڵمە چییە بە پێمەوە؟"



# هێلکەی وشترمرخ



لەسـەر قەنەفەکەم ڕاکشـابووم و سـەرقاڵی لێکـۆڵینەوە بـووم بـۆ کتێبێکـی نـوێم، کە بە نیـازبووم نـاوی بنـێم: "وردەکارییەکـانی هـونەری بەکارهێنـانی چەتـر و شـتە گرنگەکـانی دیـکە". لەو کـاتەدا زەنگـی تەلەفـۆن لێیـدا. هـاوڕێیەکی کـۆنم بـوو و پرسـیارێکی زۆر سەیری لێ کردم.

- دەبێـت هـێلکەوڕۆن بـۆ دوانـزە کەس دروسـت بـکەم. چەنـد هێلکەم پێویستە؟

- تەنها یەک هێلکە!"

- تکایە گاڵتەم لەگەڵ مەکە! بەڕاستمە.

- ئـێ باشـە، منـیش بەڕاسـتمە. یەک هێلکەتـان دەوێـت، بەڵام ئەگەر هێلکەکە هێلکەی وشترمرخ بێت!

هـــاوڕێ کــۆنەکەم ئەم وەڵامەی زۆر بەدڵ بـــوو. سوپاســـی کــردم و تەلەفـۆنەکەی داخســتەوە. لە بیـری خۆمـدا وتــم: "خۆزگە پێم بوتایە بە گاڵتەم بوو!"



بەڵــێ، بە گــاڵتەم بــوو، بەڵام قســەکەم ڕاســـت بـــوو. چـــونکە هەر بەڕاســـتی دەتوانیـــت بە هێلکەیەکـــی وشــــترمرخ بەئاســانی هێلکەوڕۆنێــک بەشـــی دوانــزە کەس بکـــات، ئامـــادە بکەیـــت. بێگومـــان ئەمە ئەگەر هـــێلکەی وشــترمرختان دەســت بکەوێــت و تــاوەیەکی هێنــدە گەورەتــان هەبێت تێیدا سووری بکەنەوە.

هێلکەیەکـــی وشـــترمرخ بەقەدەر نـــزیکەی ٢٤ هـــێلکەی مریشــکە. (بە گــوێرەی ئەمە بێــت، گەر دوانــزە کەس هێلکەیەکـی وشــترمرخ بخــۆن، وەک ئەوەیە یەکــی دوو هــێلکەی مریشــکیان خواردبێــت. دەی ئەمەش بەشـــی کەســێکی ئاســایی دەکــات، وا نییە؟ وا نییە!)

ئینجــا هاوڕێیـــان، تـــوێکڵی ئەم هـــێلکە گەورەیە لەوانە نیـــیە کەوچکێکــی پێـدا بکێشـیت و بشـکێت. تەنـانەت ئەگەر باوکیشـم بچێـــتە ســـەر هێلکەیەکـــی وشـــترمرخ بـــۆی ناشـــکێت، چـــونکە هێلکەی وشترمرخ دەتوانێت کەسێکی ٩٠ کیلۆیی ڕابگرێت!

لەم نێوەنـــــدەدا گەر درکتـــــان پێکردبێـــــت، پێویســـــتییەکانی ئامــادەکردنی هــێلکەوڕۆن لە هــێلکەی وشــترمرخ وردە وردە زیــاد دەکات: هێلکە + تاوەیەکی گەورە + چەکوش...

## هێلکەکانی مزگەوت

ئێوە هەرگیز هێلکەی وشترمرختان بینیوە؟

من بۆ یەکەم جار لە "مزگەوتی سلێمانی" بینیم!

سەرتان سوورنەمێنێت، با بۆتانی باس بکەم:

کاتێــک ئەنــدازیار ســینان مزگەوتــی ســلێمانی دروســت کــردووە، هــێلکەی وشــترمرخی لە نێــوان چراکانــدا دانــاوە. لەبەر ئەوەی ٤٠٠ ســاڵی بەســەردا تێپەڕیــوە، زۆربەی ئەو هێلکــانە یــان شــکاون، یــان دزراون. ژمارەیــان لە ٣٠٠ هــێلکەوە بــۆ ٣٠ هــێلکە کەمــی کــردووە. ئەو ٣٠ هــێلکەیەی مــاونەتەوە، ڕەنگیــان گــۆڕاوە و قــاوەیی هەڵــگەڕاون. بەڵام گەر بەســەرنجەوە تەماشــایان بــکەن دەزانن هێلکەن.

ئەم هێلکــانە بە فەرمــانی خــودی ســوڵتان ســولەیمان قــانوونی لە ئەفریقاوە هێنراون.

بەر لەوەی ئێوە بپرسن، با خۆم بپرسم:

"هـــێلکەی وشـــترمرخ چ کـــاری بە چراکـــانی مزگەوتـــی سلێمانییە؟"

جاڵجاڵۆکە!

بەڵێ، بەهۆی جاڵجاڵۆکەوە بووە!

دەوترێـــت هـــێلکەی وشـــترمرخ بـــۆنێکی تـــایبەتی لێـــدێت کە جاڵجـــاڵۆکە زۆر بێـــزار دەکـــات. ئەنـــدازیار ســـینانی بلیمەتـــیش ٤٠٠ ســـاڵ لەمەوبەر ئەوەی زانیـــوە، بـــۆیە هـــێلکەی وشـــترمرخی بە مـــزگەوتەکەدا هەڵواســـیوە. بەم جـــۆرە هـــیچ جاڵجـــاڵۆکەیەک نەیتوانیـوە بێـت و لە مـزگەوتەکە تـۆڕ بچنێـت. سـەرئەنجام بەهـۆی بیـرۆکە نـاوازەکەی ئەنـدازیار سـینانەوە، پـاککردنەوەی مـزگەوتەکە لە تۆڕی جاڵجاڵۆکە لە بنەڕەتەوە کۆتایی پێ هێنراوە.

## ئایا وشترمرخ، وشترە؟

مـادەم باسـی هـێلکەکەی دەکەیـن، بـا کەمێـک باسـی خۆشـی بکەیـــن. گێـــڕانەوەیەک هەیە دەڵێـــت: جارێکیـــان بە وشـــترمرخیان وتـــووە: "ئەم توورەکانەمـــان بـــۆ هەڵبگـــرە!" ئەویـــش وتـــویەتی: "مـــن باڵنـــدەم." وتویـــانە: "دەی کەوایە بفـــڕە!" وتـــویەتی: "فڕینـــی چـــی؟ من وشترم!"



وشـــترمرخ باڵنــــدەیە. هەروەک باڵنــــدەکانی دیــــکە دوو بــــاڵ و دوو قـــاچی هەیە و هـــێلکە دەکـــات، بەڵام ناتوانێـــت بفڕێـــت، چـــونکە باڵەکـــانی لە چـــاو جەســـتەیدا هێنـــدە گەورە نـــین توانـــای فڕینیان هەبێت.

پەروەردگـــار توانـــای فڕینـــی بە وشـــترمرخ نەداوە. باشـــتریش کە نەیـــداوە. بیـــربکەنەوە باڵنـــــدەیەکی ٢,٥ مەتـــری ١٢٠ کیلـــۆیی بەســـــەر ســـــەرتانەوە بفڕێـــت! ئەگەر بیەوێـــت لەســـــەر شـــانتان بنیشێتەوە، چی دەکەن؟!

وشـــترمرخ نافڕێـــت، بەڵام زۆر خێـــرا ڕادەکـــات. قاچەکـــانی زۆر بەهێـــز ن. پێـــی تەنیـــا دوو پەنـــجەی گەورەی هەیە. یەکێـــک لەو پەنجـــانە لەوی دیکەیـــان گەورەتـــرە و تەنیـــا لەســـــەر ئەو پەنـــجە گەورەیەیـــان ڕادەکەن. بەگشـــتی خێراییـــان دەگـــاتە ٧٠ کیلـــۆمەتر لە کاتژمێرێکدا.

## سەرخستنە ژێرلم؟

بیستوتانە یەکێ بە یەکێ دەڵێت: "دەڵێیت وشترمرخیت سەرت خستووەتە ژێر لم"؟ گوایە وشترمرخ کاتێک هەست بە مەترسی دەکات، سەری دەخاتە ژێر لم، بەم جۆرە دوژمنەکەی دێت و دەیکاتە یەک پاروو.

لە ڕاستیدا شتی وا بوونی نییە. وشترمرخ بۆ خۆپاراستنیان قاچە بەهێزەکانیان بەکار دەهێنن. یان خێرا ڕادەکەن، یان جووتەیەک دەوەشێنن تەنانەت پڵنگیش بتاسێنن. بەڵام کاتێک دەیانەوێت پشوو بدەن، ڕادەکشێن. بەم جۆرە ئەوەی لە دوورەوە تەماشا بکات، تەنیا جەستەیان دەبینێت و ملیان نابینێت و وا دەزانێت سەری خستووەتە ژێر لم. بەڵام لە ڕاستیدا وشترمرخەکە دەبینێت. باشیش دەبینێت. بە دوو چاوی زەقی گەورەوە، کە تیرەیان ٥ سەنتیمەتر دەبێت و هی هیچ باڵندەیەکی دی هێندە گەورە نییە. ئینجا خۆی ئامادە دەکات بۆ شەق وەشاندن و چاوەڕێ دەکات لێی نزیک ببێتەوە. ئیتر بیرتان بێت!

بەر لەوەی بیرم بچێتەوە، با پێتان بڵێم: ئەو هاوڕێیەم کە لە سەرەتاوە باسم کرد، دوای نزیکەی کاتژمێرێک تەلەفۆنی

کـردەوە و پرســی: "باشــە، مــن هــێلکەی وشــترمرخ لە کـوێ پەیـدا بکەم؟"

پــێم وت: "نــازانم! لە هەمــووی باشــتر ئەوەیە ڕاکەیــت بــۆ سەری کۆڵان و یەکی دوو هێلکەیان بۆ بکڕیت!"



# ئێستا کاتی کۆچە!



وەرزی هـــــاوین، بەو ڕۆژە دوورودرێـــــژانەیەوە دەڵێیـــــت تەواوبــوونی نیــیە. بەڵام تەماشــا! لەقلەقەکــان پــۆل پــۆل دەســتیان کردووە بە کۆچ و هێلانە گەورەکانیان چۆڵ کردووە.

پەرەســێلکە کەشــخەکانیش، بەو کلــکە ناوازەیەیــانەوە بە ژوور ســەرماندا دەڕۆن و کــۆچ دەکەن. تونــد دەرگــای مــاڵە قوڕینەکــانی گوێسەبانەکانیان دادەخەن و دەڕۆن...

شــەوان گەر خەومــان لــێ بزڕێــت، دەتــوانین گــوێمان لە دەنگــی قــازە کێوییەکــان بێــت کاتێــک بە ســەرمانەوە دەفــڕن. گەر دەزانن چ ڕێیەکی دووریان لەپێشە!

بە منداڵی لە دوای لەقلەقەکانەوە گۆرانیمان دەوت:

**"لەقلەق لەقلەق دوور مەڕۆ**

**بان و شارمان چۆڵە بێ تۆ"**

**کاتێــک بــاڵە گەورەکــانی دەکــردەوە و بە ســەرماندا دەفــڕی، دەمــانوت: "ئـێمەش بەرە لەگەڵ خـۆت! دەی توخــوا، ئـێمەش بــبە بــۆ ئەو جێـیەی بـۆی دەچیـت! بــا منــداڵەکانیان بناســین و یارییــان لەگەڵدا بکەین..."**



کە کــاتی کــۆچ هــات، باڵنــدەکان کــۆچ دەکەن. لە ڕاســتیدا لە جیهانی ئاژەڵانــدا تەنهــا باڵنــدەکان کــۆچ نــاکەن. فیــل و کەرەکێــوی و هەنــــدێک لە مێرووەکــــان و ماســــی ســــەلەمۆن و... چەنــــدین ئــاژەڵی دیــکەش کــۆچ دەکەن. بەڵام کــۆچی باڵنــدەکان لە هــی هەموویــان سەرنجڕاکێشــترە. جــگە لەوەی کاتێــک کــۆچ دەکەن ماڵئــاواییمان لێــدەکەن و دەســتمان بــۆ ڕادەوەشــێنن (ڕاســترە بڵــێم باڵمان بۆ ڕادەوەشێنن).

# باڵندە کۆچەرییەکان

ئەو زانایـــانەی لە باڵنـــدە کۆچەرییەکـــان دەکـــۆڵنەوە، بەزۆری پەرۆشی وەڵامی ئەم پرسیارەیانە:

"بـــۆچی هەنـــدێک لە باڵنـــدەکان کـــۆچ دەکەن و هەنـــدێکی دیکەیـان کـۆچ نـاکەن؟" بـۆ نمـوونە، پەڕەسـێلکە کـۆچ دەکـات، بەڵام چۆلەکە کۆچ ناکات؟

لە ڕاســـتیدا وەڵامـــی ئەم پرســـیارە بەتەواوی ڕوون نیـــیە. وەک چۆن کاتێـک شـەو داهـات خەومـان دێـت، لەگەڵ کـاتی کـۆچیش هـــات هەنـــدێک لە باڵنـــدەکان ئـــارەزووی کـــۆچ دەکەن. ئیـــدی دەکەونە ئامادەکـــاری بـــۆ گەشـــتەکەیان و کۆمەڵێـــک گۆڕانکـــاری بەسەر جەستەیاندا دێت.

ڕووداوگەلێکــــــی وەک ســــــاردبوونی کەشــــــوهەوا، کورتبـــوونەوەی ڕۆژگـــار، درێژبـــوونی شـــەوگار و کەمبـــوونەوەی تینـــی خـــۆر کـــار لە باڵنـــدەکان دەکەن. ئـــارەزووی خواردنیـــان دەکـرێتەوە و نەوسـن دەبـن. لە مـاوەیەکی کەمـدا چەورییەکـی زۆر لە جەســــــتەیاندا کــــــۆدەبێتەوە. چــــــونکە لە گەشــــــتە دوورودرێژەکەیانــــدا پێویســــتیان بە وزەی زۆر دەبێـــــت. ئەو چەوریـــیەش لە ڕێـــگە دەتـــوێتەوە و وزە بە باڵنـــدەکان دەبەخشـــێت.

فڕۆکە چۆن بەر لەوەی بفڕێت سووتەمەنی پێویست هەڵدەگرێت، ئەمانیش بەو جۆرە دەکەن!



## فڕین چ کارێکی سەختە!

ئاسانترین ڕێگە بۆ گەیشتن بە شوێنێک چییە؟ گەر دەڵێن: "فڕینە!" ئەوا جارێکی دیکە بیر بکەنەوە. چونکە فڕین لە هەموویان سەختترە. ئێمەی مرۆڤەکان سەرەڕای ئەوەی هەزاران ساڵە بە گالیسکە هاتوچۆ دەکەین، بەڵام تەنیا لە سەد ساڵی ڕابردوو ڕێی فڕینمان دۆزیوەتەوە.

چونکە فڕین پێویستی زۆری هەیە. ئێوە مەڕوانن باڵندەکان وا بەئاسانی دەفڕن. لەبەر ئەوەی خودا بە شێوەیەکی گونجاو بۆ فڕین دروستی کردوون، بۆیە دەتوانن بەئاسانی بفڕن. سەرەڕای

ئەمەش باڵنـــــدە کۆچەرییەکــــان لە درێـــــژەی گەشـــــتەکەیاندا ڕووبەڕووی زۆر بـــارگرانی دەبـــنەوە. لەگەڵ ئەوەشـــدا بەهـــۆی پێکهـــاتە سروشــــتییەکەیانەوە ئەم بارگرانیــــانە لە گەشــــتەکەیان دایاننابڕن.

بـــۆ نمـــوونە، گوێیەکـــانی باڵنـــدە وەک پەســـتانپێو کـــار دەکەن. بەم جـــۆرە لە پەســـتانی هەواکەوە تێـــدەگەن چەنـــدێک لە زەوی بەرز بـــوونەتەوە. گەر گوێیەکـــانی ئـــێمەش وەک هـــی باڵنـــدەکان بوونـــایە، ئەوا دەمـــانتوانی بـــێ ئەوەی لە پەنـــجەرەکەوە ســـەر ببەیـــنە دەرەوە، بزانین لە چەندەم نهۆمی بینایەکداین.

گوێیەکانیـــان لە هەمـــان کاتـــدا بـــۆ پێشـــبینیکردنی بـــاری کەشـــوهەواش بەکەڵـــکە. واتە باڵنـــدەکان پێشـــوەختە هەســـت دەکەن کەشوهەوا تێکدەچێت، باران دەبارێت، دەبێتە تۆفان...

زۆر باڵنـــدە، هێنـــدەی بتوانێـــت حەز دەکـــات لە بەرزی بفڕێـــت. بـــۆ نمـــوونە، هەنـــدێک جـــۆری قـــاز دەتـــوانن لە بەرزیـــی ٧ بـــۆ ٨ کیلـــۆمەتر بفـــڕن. لەم بەرزیـــیەدا ڕێـــژەی ئۆکســـجین زۆر کەمە. واتە مـــرۆڤ ناتوانێـــت لەم بەرزیـــیەدا هەناســـە بـــدات. بەڵام ســـییەکانی باڵندە لە هی ئێمە جیاوازترن. بۆیە هەناسەیان لەبەر نابڕێت.

ئـــێمە چـــۆن هەناســـە دەدەیـــن؟ هەناســـە هەڵـــدەمژین و دەیـــدەینەوە، دواتـــر هەناســـەیەکی دی هەڵـــدەمژین و دەیـــدەینەوە... واتە بـــۆ ئەوەی هەناســـەیەکی نـــوێ هەڵبمـــژین ســـەرەتا دەبێـــت ئەو

هەوایەی پێشـــتر هەڵمانمژیـــوە، بیـــدەینەوە. بەڵام سیســـتمی هەناســـەدانی باڵنـــدەکان هێنـــدە سەرســـوڕهێنەرە کە دەتـــوانن بـــێ پچـــڕان هەناســـە هەڵبمـــژن و بیـــدەنەوە. بەهـــۆی ئەم سیســـتمەوە دەتوانن هەوای زیاتر هەڵبمژن و ئۆکسجینی زیاتریان پێبگات.

لەو بەرزیـــیەدا پـــلەی گەرمـــیش بـــۆ ٢٠ پـــلەی ژێـــر ســـفر دادەبەزێـــت. مـادەم ئـاو لە پـلەی سـفردا دەیبەستێت، کەوایە دەبـوو باڵنـــدەکان هێنـــدەی یەک و دوو بیانبەســـتێت و وەک پـــارچە ســـەهۆڵێک بـــکەونە خـــوارەوە، وا نیـــیە؟ چـــونکە ئەمە تەنـــانەت لە بەفرگرەکانیشـــمان ســـاردترە. خـــۆ بینیوتـــانە کاتێـــک دایکتـــان مریشکێک لە بەفرگرەکە دەردێنێت چی لێهاتووە؟

بەڵام نەخێـر، باڵنـدەکان نایانبەسـتن! بـۆچی؟ زاناکـان هێشـتا نـــازانن بـــۆچی. لێکـــۆڵینەوەی لەســـەر دەکەن، بەڵام نایـــدۆزنەوە. ئەوەیان کە لە هەموویان ژیرترە دەڵێت:

"خـــودا سیســـتمێکی هێنـــدە نـــاوازەی لە جەســـتەی باڵندەکانـــدا دروست کردووە، کە هێشتا بەتەواوی لێی تێناگەین!"

## ئۆرسۆدرۆم

ئۆرسۆدرۆم چییە؟ وا بزانم یەکەم جارە ئەم وشەیە دەبیستن.

ئۆرسـۆدرۆم بەکـورتی واتە کـورترین ڕێـگەی نێـوان دوو خـاڵی سەر گۆیەک.

بـۆ ئەوەی بتـوانین کـورترین ڕێگـای نێـوان دوو خـاڵی سـەر گـۆی زەوی دیـاری بکەیـن، دەبێـت کۆمەڵێـک هاوکێشـەی زۆری بیرکـاری بـزانن. یـان دەبێـت کەشـتییەکی ئاسـمانی بـدۆزنەوە و بچـــنە ئاســـمان و لە پەنـــجەرەی کەشـــتییەکەوە تەماشـــای زەوی بـکەن و بە گـریمانەی چـاو کـورترین ڕێـی نێـوان دوو خـاڵەکە دیـاری بـکەن. ئیـتر هەر شـێوازێکیانتان پـێ ئاسـانترە دەتـوانن ئەوەیان بەکار بهێنن.

لە ڕاسـتیدا شـێوازێکی دیـکەش هەیە، بەڵام وا نـازانم هـیچ کەسـتان ئەم ڕێـیەی بەدڵ بێـت! بچـن مێشـکتان لەگەڵ مێشـکی باڵنـدەیەک بگـۆڕنەوە! چـونکە کاتێـک باڵنـدەکان بـۆ شـوێنێک کـۆچ دەکەن، بە نـزیکترین ڕێـگەدا دەڕۆن. واتە بە ئۆرسـۆدرۆمدا. دەتوانن ئێوە پێی بڵێن: قەدبڕ.

لەم نێوەنـــدەدا، کەشـــتیوانەکان بـــۆ گەشـــتەکانیان بەنێـــو ئۆقیانووســـەکاندا لە ســـەدەی نۆزدەهەمـــدا ئەوجـــا بەباشـــی دەیانتوانی ئۆرسۆدرۆم بەکار بهێنن.

# "هاوسێ گیان، ئەفریقا لە چ لایەکەوەیە؟"

ئەگەر نیازتـــان هەبێـــت بـــۆ گەشـــتێکی دووروودرێـــژ بەرێ بـــکەون، ئەوا ســـەرەتا دەبێـــت ڕێگەکەتـــان بـــدۆزنەوە. گەرنـــا ون دەبـــن. پۆلێـــک لەقـــلەق لەم وڵاتەی ئـــێمەوە چـــۆن دەچـــن بـــۆ ئەفریقـــــا؟ چـــــۆن ڕێگەکەیـــــان دەدۆزنەوە؟ گـــــرنگترین ڕازی کـــۆچکردن ئەمەیە. تـــا ئێســـتاش ئەم ڕازە بـــۆ زاناکـــان ڕوون نەبووەتەوە.

بە گـــــوێرەی هەنـــــدێک لە لێکۆڵینەوەکـــــان، باڵنـــــدەکان بە ســـەرنجدانە شـــاخ و ڕووبـــار و دەشـــتەکانی ســـەر ڕووی زەوی ڕێگەکەیان دەدۆزنەوە.

بەڵام زۆر باڵنـــدە بە شـــەو گەشـــت دەکەن! هەندێکیشـــیان دەچـــنە ســـەروو هەورەکـــان! لێـــرەدا دەتـــوانین بڵێـــین: "بە ســـەرنجدانی خـــۆر و ئەســـتێرەکان ڕێگاکەیـــان دەدۆزنەوە!" ئەی باشە، ئەوانەی لە ژێر هەورەکانەوە و بە شەو دەفڕن، چی؟

بەگـــوێرەی تـــازەترین بیـــردۆز، مێشـــکی باڵنـــدەکان شـــتێکی هاوشـــێوەی قیبلەنمـــای تێـــدایە. بێگومـــان ئەمە لە قیبلەنماکـــانی خۆمـــان نـــاچن. هەنـــدێک مـــاددە لە مێشـــکیاندایە تایبەتمەنـــدیی موگناتیســـییان هەیە. ئەم مـــاددانە وەک دەرزی قیبلەنمـــا ڕێـــی ڕاست نیشانی باڵندەکان دەدەن.

# دەی هەموومان پێکەوە!

باڵنــدەکان بە پــۆل کــۆچ دەکەن. ئەمەش ســوودی زۆرە. بــۆ نمــوونە، کاتێــک باڵنــدەیەکی دڕنــدەی وەک هەڵــۆ هەزاران باڵنــدە پــێکەوە دەبینێـــت، دەترســێت و پەلاماریـــان نـــادات. بەچـــکە باڵنـــدەکانیش، کە یەکەم جاریـــانە کـــۆچ دەکەن، لەگەڵ خـــزم و کەسیاندا بۆ کێشە کۆچ دەکەن.

**باڵنــدەکان لە شــێوەی ژمــارە حەوتــدا دەفــڕن. ئەمەش ســوودی بـــۆ ڕێـــیە دووردرێژەکەیـــان زۆرە. ئەو تەوژمە هەوایەی بەهـــۆی بـــاڵی باڵنـــدەکەی پێشـــەوە دروســـت دەبێـــت باڵنـــدەکانی دواوە هێـــواش دەکـــاتەوە. بـــۆیە ئەگەر باڵنـــدەکان وەک شـــەمەندەفەر بە دوای یەکـــدا بفڕینـــایە، ئەوا ئەوانەی دواوە زۆر مانـــدوو دەبـــوون. بەڵام لەبەر ئەوەی لە تەنیشـــت یەکـــترەوە دەفـــڕن، بـــۆیە تەوژمە هەواکەی ئەوەی پێشـــــــەوە یـــــــارمەتی ئەوانەی دواوە دەدات. بەم جــۆرە هەمــووان ســوود لەوەی پــێش خۆیــان دەبیــنن. ئەمەش وا دەکــات هەر باڵنــدەیەکی کــۆمەڵەکە لە لە چــاو باڵنــدەیەکی دیــکەدا کە بەتەنهــا دەفڕێــت، ڕێــژەی ٧٠٪ کەمــتر وزەی پێویســـت بێــت! بەڵام ئەو باڵنـــدەیەی لە پێشـــەوە دەفڕێـــت، لە هەموویـــان مانـــدووتر دەبێت. بۆیە زوو زوو باڵندەکەی پێشەوە دەگۆڕێت.**



## بابەتی گەرمبوونی هەوا

هەموومــان دەزانــین کاتێــک هەوا گەرم دەبێــت، بەرز دەبێـتەوە. باڵنــدەکانیش گەرچـــی ئەمە نەزانـــن، بەڵام هەســتی پێــدەکەن. تەوژمــی هەوا گەرمەکــان بــۆ باڵنــدەکان دەرفەتێکــی نــاوازەیە. وەک چــۆن ئەو مەلەوانــانەی خلیســکێنەی ســەر ئــاو دەکەن، ســوود لە شــەپۆلەکانی دەریــا دەبیــنن، بە هەمــان شــێوە، باڵنــدەکانیش تەوژمــی هەوا گەرمەکە دەکەنە ژێــر باڵیــان و بــێ ئەوەی پێویســتیان بە بــاڵ ڕاوەشــاندن بێــت بەســەر هەواکەدا دەخلیســکێن. ئەمە دەرفەتێکــی نــاوازەیە بــۆ پشــوودان. بەتــایبەتی بــۆ باڵنــدە قورسەکانی وەک پەلیکان!

لەبەر ئەوەی پەروەرێــن گــوێچکەی باڵنــدەکانی بە جۆرێــک دروســت کــردووە، درک بەم تەوژمە هەوایە بــکەن، بــۆیە هەرگیــز ئەم دەرفەتە لە دەست خۆیان نادەن.

لەم بەشەدا، هەوڵم دا باسێکی موعجیزە گەورەکانی کۆچکردنی باڵندەکانتان بۆ بکەم. دڵنیام زۆر سەرنجڕاکێش بووە لاتان.

منداڵەکان، بەتایبەتی لە وەرزی بەهار و پایزدا ناوبەناو سەرێک بەرز بکەنەوە و تەماشای ئاسمان بکەن. یەک بە دوای یەکدا پۆلی قاز و لەقەلەق و پەڕەسێلکە دەبینن. تەماشایان بکەن و دەستیان بۆ ڕاوەشێنن.

هاواریان بۆ بکەن: "ساڵی داهاتوو بگەڕێنەوە! سڵاو لە منداڵەکانی ئەو وڵاتە بکەن!" گەرچی گوێشیان لێتان نەبێت، هەستتان پێدەکەن.



# سلاو، زیکزیکەی خۆشەویست




لە کۆتاییدا دەرفەتم بۆ ڕەخسا نامەیەکت بۆ بنووسم. بڕوا بکە لە دڵمدا بوویبووە گرێ. دۆستی من، منیش وەک زۆرێک وام دەزانی تۆ کەسێکی تەمبەڵ و خەوخۆش و بێکەڵک و دەنگدەنگکەر و قۆشمەچیت. خراپەی من نەبوو! ئاخ لا فۆنتاین، ئاخ!

چی بووە قوربان! گوایە کاتێک مێروولە سەرقاڵی کارکردن بووە و ئارەقی ڕشتووە، تۆ تەواوی هاوینەکەت بە سازژەنین و گۆرانیوتنەوە بردووەتە سەر. لەسەر لقی داربییەک هەر ڕاکشاویت.

دواتر کە هەستت بە سەرمای زستان کردووە، خێرا ڕاتکردووەتە بەر دەرگای مێروولەکە و وتوتە:

"ئامـان چـی دەبێـت، کەشـوهەوا زۆر سـاردە. هـیچ خواردنیشـم دەسـت ناکەوێـت. لە برسـاندا خەریـکە دەمـرم. لە برسـاندا نەمـرم، لە سەرماندا ڕەق دەبمەوە. تکایە یارمەتیم بدە!"

مێـروولەکەش وتـویەتی: "ئەی تـۆ نەبوویـت هـاوین سـازت دەژەنـی و گۆرانیـت دەوت! دەی بـڕۆ ئێسـتا بیـژەنە!" و دەرگـاکەی بە سەردا داخستوویت.

تەماشـا! ئەو نامـاقوڵییەی لا فۆنتـاین! ئەو بوختـانەی بـۆ تـۆی هەڵبەسـتووە، بەس نەبـووە، ئەو مێـروولە چـالاک و مەردەشـی بە ستەمکار و ڕەزیل دەرخستووە.

زیکـزیکەی خۆشەویسـت، ئیـتر دڵگـران مەبە، چـونکە مـن بە هەمـوو شـتێکم زانیـوە. مێـروولەیەک یەک بە یەک ڕووداوەکـانی بـۆ گێـڕامەوە. تێگەیشـتم ڕاسـتییەکە لە هەواڵە باوەکـان زۆر جیاوازترە.

چیرۆکـی تـۆش، وەک چیرۆکـی هەموومـان، لە سـکی دایکتەوە دەستی پێ کردووە.

حەڤـدە سـاڵێک لەمەوبەر. دایکـت تـۆی لەنـاو لقێکـی تەڕ و تـازە و بچـووکی درەختێکـی گەورە دانـاوە -بێگومـان ئەو کـاتە تـۆ هێشتا گەرایەک بوویت-.

پــاش مــاوەیەک گەراکەت تەقیــوە و وەک کرمــۆکەیەکی وردیــلە هــاتوویتە دنیــاوە. بە درێژایــی چــوار هەفــتەی تەواو بە خــواردنی ئاوی ئەو لقە دارە گۆشبوویت.

کاتێــک‌لە لــقەکە هــاتوویتە دەرەوە، نە دایکــت لا بــووە، نە باوکــت. چــونکە ئەوانە مــاوەیەکی زۆر لەوەوبەر کــۆچی دواییــان کردبوو.

پەروەرێــن دوو قــاچی زۆر بەهێــز و دەمێکــی هاوشــێوەی دەنــووکی پــێ بەخشــیبوویت. بە بەکارهێنانیــان توانیــوتە لە کەلێنــی لقەکەوە بێیتە دەرەوە.

دەتــوت فەرمانێکــت پــێ دراوە و تــۆش ناچاربوویــت گــوێڕایەڵی فەرمــانەکە بیــت. بــێ بیرکــردنەوە لەســەر لقــی دارەکەوە خۆت هەڵداوەتە خوارەوە.



هەر کە کەوتـــوویتە ســـەر زەوی، خێـــرا بەو قـــاچە بەهێـــزانەت کەوتوویتە هەڵکۆڵین.

دەی دەی، دەی دەی، دەی دەی...

لە کۆتاییـــدا گەیشـــتوویتە ڕەگێکـــی درەخـــتەکە. زۆر مانـــدوو و برســـــی بوویـــــت. گــــازت لە ڕەگەکە گرتــــووە و ئاوەکەیــــت خواردووەتەوە.

هەر خواردووتەوە تا تێربوویت...

ئینجا کەوتوویتەوە هەڵکۆڵین تا بە ڕەگێکی دیکە بگەیت.

دواتر ڕەگێکی دیکە...

ئینجا ڕەگێکی دیکە...

ئینجا ڕەگێکی دیکە...

پاشان ڕەگێکی دیکە...

مـــاوەی حەڤـــدە ســـاڵی ڕێـــک لە ژێـــر گـــڵەکەوە، تونێلـــت هەڵکۆڵیوە و ئەم ڕەگ و ئەو ڕەگت کردووە!

ئەگەر لا فۆنتـــاین ئەمەی ببیســـتایە، هەرگیـــز بە تـــۆی دەوت تەمبەڵی خەواڵوو؟

لە کۆتـــایی ســـاڵی حەڤدەیەمـــدا، ئیـــدی کـــاتی هـــاتنە دەرەوەت هـــاتووە. گەورە بووبوویـــت. تـــوێکڵێکی ئەســـتوورت بە ســـەرەوە

بووه. له ژێر توێکڵەکەشتەوە جووتێک باڵت هەبوون، کە لەژێر گڵەکەدا هەرگیز لە حیکمەتەکەیان تێنەدەگەیشتیت.

ئەو پەروەرێنەی لە تاریکایی ژێر گڵەکەدا ئەو باڵە توێژاڵیانەی پێ بەخشیبوویت، بێگومان دەیزانی ڕۆژێک پێویستت پێیان دەبێت.

وەرزی هاوین، مانگی ئاب و تاریک و لێڵی بەیانی بووە. لە گڵەکەوە هاتوویتە دەرەوە. بینیوتە لە دارستانێکی گەورەدایت.

تا یەک دوو ڕۆژ نەهاتوویتەوە سەر خۆت. ناهەقیشت نەبووە، دوای حەڤدە ساڵ ئارامگری و تەوەککول لەژێر گڵدا، بینینی ڕووی زەوی، هەستکردن بە خۆر، گەر کەمێکیش بێت لەنێو لق و گەڵا دارەکانەوە تەماشاکردنی ئاسمانی شین و پەڵە هەورە سپییەکانی ڕووی ئاسمان چاویان ئەبڵەق کردوویت.

وتووتە: "خوایە گیان! ئەم دنیایەت چەند جوانە!"

هێندەت زانیوە توێکڵە ئەستوورەکەت دڕاوە. بۆ یەکەم جار لە ژیانتدا باڵەکانت کردووەتەوە و لە بەر خۆردا وشکت کردوونەتەوە.

دواتر تەماشایەکی خۆتت کردووە.

لە ڕووی پشـــتەوەی نـــاو قەدتەوە، کەمێـــک خـــوارووی ئەو شـوێنەی هەناسـەی لێـوە دەدەیـت، دوو تـوێکڵی ڕەقـت بینیـوە، کە بە پەردەیەکـــی تەنـــک داپـــۆشراون و پەردەکەش زۆر تونـــد بـــووە. پـــاش مـــاوەیەک بینیـــوتە ئەو تـــوێکڵانە بە کۆمەڵێـــک ماســـولکەی جەســـتەتەوە بەنـــدبوون. بەڵام خۆشـــترین شـــت ئەوە بـــووە کاتێـــک ئەو ماســـولکانەت گـــرژ و خـــاو کـــردووەتەوە، لەو تـــوێکڵانەوە دەنگێکـــــی ســـــەیر دەرچـــــووە. جـــــگە لەوەش، جەســـــتەت بە شـــێوەیەک ئەفـــرێنراوە بتوانێـــت لە چرکەیەکـــدا ٥٠٠ جـــار ئەو ماسولکانە گرژ بکات.

لەبەر خـــۆتەوە وتـــوتە: "ئەمە نـــاوازەیە! مـــن دەتـــوانم بەمە گۆرانی بڵێم!"

تـاکە شـتێک لا فۆنتـاین ڕاسـتی کـردووە ئەوە بـووە زیکـزیکە بە درێژایـی هـاوین گـۆرانی دەڵێـت. بەڵام بـۆچی؟ لا فۆنتـاین ئەمەی نەزانیـــوە. لەبەر ئەوەی نەشـــیزانیوە تـــۆی بە کەســـێکی بێکـــاری بێزارکەر داناوە.

بەڵام من بنچینەی ئەم کارە دەزانم.

زیکـزیکەی خۆشەویســـت، ڕەنـــگە زانیبێتـــت، ڕەنگیشـــە تەنیـــا هەســـتت پێکردبێـــت. لەســـەر ڕووی زەوی تەنهـــا چـــوار هەفـــتە

دەژیـــت. زۆر کـــاری گرنـــگ هەبـــووە پێویســـتبووە ئەنجامیـــان بدەیت.

لەبەر ئەوەی تـۆ زیکزیکەیەکـی نێـر بوویـت، دەبـوو بەر لەوەی ژیانـت بە کۆتـا بگـات، هاوسـەرێک بـۆ خـۆت پەیـدا بکەیـت. باشـە، لەو دارسـتانە فـراوانەدا و لە نێـوان ملیۆنـان مێـرووی دیـکەدا چـۆن دەتـوانی هاوسـەرێکی گونجـاو بـۆ خـۆت هەڵبژێریـت؟ بێگومان بە گۆرانی وتن!

لەبەر ئەوەی زۆرت پەلە بـووە شـەو و ڕۆژ بێوچـان گۆرانیـت وتووە.

لە کۆتاییـدا هاوسـەرێکت بـۆ خـۆت دۆزیـوەتەوە. لانەیەکـی بەختەوەرتـان پێکهێنـاوە. ئیـدی هاوسـەرەکەت پێویسـتبووە، وەک دایکـت، گەراکـانی لەنـاو لقـی دارێکـدا دابنێـت! چـونکە تەنیـا بەم جـۆرە دارسـتانەکان لە گـۆرانی و شـادیی زیکزیکەکـان بێبەش نابن.

ئێـوە زۆر گـرنگن! گۆرانییەکانیشـتان زۆر پێویسـتن! چـونکە دەبـوو ئـێمە لە شـەوانی هاوینـدا، کە ئەسـتێرەکان و مـانگی درەوشـاوە لە ئاسـماندا زەردەخەنەیـان بە ڕوومانـدا دەکـرد، گـوێمان لە دەنگـی ئێـوە بێـت. دەبـوو هەنـدێک جـار لە قـووڵایی

دارستانەکانەوە، هەندێک جاریش لە پشت لقی دار قۆخەکەی باخچەکەمانەوە هاوار بکەن:

"خودایە گیان، دنیاکەت چەندە جوانە! ئەم دنیایە چەندە جوانە! خودایە گیان، تۆ چەندە جوانیت!"

هەندێکمان گوێمان لێی دەبوو، هەندێکمان گوێی لێنەدەبوو، هەندێکمان لێی تێدەگەیشتین، هەندێکمان لێی تێنەدەگەیشت... بەڵام ئێوە دەبوو بەردەوام بن.

لەگەڵ کۆتایهاتنی مانگی ئابدا، کاتێک گەرا خرپنەکانتان لەناو لقە باریکەکانی درەختێکدا پڕخەی خەویان دەهات، لەناکاو کۆتاییت بە گۆرانییە بەردەوامەکەت هێناوە.

ئیتر کاتی جێهێشتنی دنیا هاتووە. بەر لەوەی کەشوهەوا سارد بکات و زستان بێت ڕۆیشتوویت. ئەو لا فۆنتساینە هەر نەبێت دەبوو ئەمەی بزانیایە، ئەی وا نییە؟

تۆ بەسەر خۆتی مەهێنە، گوێی مەدەرێ! ناخت ئاسوودە بێت. هەموومان فێربووین چ ژیانێکی سەرقاڵت هەبووە.

خوات لەگەڵ زیکزیکەی خۆشەویست!

خوات لەگەڵ!

- ڤزززز! ڤزززززز! ڤززززز!
کاکە، لەلاسایکردنەوەی مێشدا چۆنم؟

- گیانەکەم، کتێبەکە تەواو بووە. حەزدەکەیت بالەوە زیاتری لەسەر نەڕۆین...



# پێڕست




- مێرووەکان
- گەردوون
- ئاژەڵەکان
- ڕووەکەکان
- ئاسمان و بەرگەهەوا
- ڕووی زەوی
- جەستەی مرۆڤ
- گەردیلە
- خانە
- باڵندەکان
- ماسییەکان
- ڕەنگ و ڕووناکی
- هەنگەکان
- مێروولەکان
- پەپوولەکان
- خشۆکەکان
- دایکەکان
- درەختەکان
- چاو
- گوێچکە
- مێشک
- لووت